دەسەڵاتی حیزبەکانی باشور ڕەوایی سیاسییان نەماوە  لاپەڕە ( 33 )

# کۆنتــــــراکت

ژمارە 2    گۆڤارێکی سیاسییە    ساڵی 1998

هیچ کەسێک بە سەرکردەیی لە دایک نابێت، هیچ سەرکردایەتیەکیش تا مردن نییە

هەر مانگەی زیاد لە دوو هەزار کەس بە لوغم دەمرێت

لاپەڕە ( 21)

کە پێم دەڵێیت دەنگ بدە بە سەوز ، بانگم دەکەیت دەنگ بدەم بە زەردیش !

لاپەڕە ( 46)



باشە گوناهمان چی بوو، ئاوامان لێ بەسەر هات، چیمان کردبوو خوایە گیان !

لاپەڕە ( 25)



ڕوشنبیران سکووت بە خویان دەکەن، بەڵام ناتوانن دەسەڵاتەکان ڕووسوور بکەنەوە!

لاپەڕە ( 53)



هێنانی سوپای داگیرکەرانی کوردستان جگە لە تاوان و خیانەت بەو لاوە، ناوێکی دیکەی ناتوانم لێبنێم. (سەبری بۆتانی ) لاپەڕە ( 44 )

## جگە لە ماڵ و مەڕو ماڵاتیان ژنەکانیشیان حەڵاڵتانن

بروانە لاپەڕە 29

# ئەو دەسەڵاتەی ڕێزی نەبێت بۆ خەڵک، بێڕێزیی خۆتە وەڵامت نەبێت بۆی

ئەوەی ڕێزی بۆ میللەت نەبێت، پیشەکی ڕێزیشی بۆ تۆ دانەناوە کە ئەندامێکی تیایدا. ئەوانەی بە هەر هۆیەکەوە بێت میللەتەکەیان بەرەوڕوی تیاچوون کردۆتەوە، بێ دوودڵی بەرەی خۆیان هەڵبژاردووە. ئەو مافەیان داوە بە خۆیان کە پێ بەسەر هەموو ڕەوشتێکی میللی و جوانییدا بنێن، ئەوەشیان داناوە بۆ تۆکە ئەرکی سەرشانی خۆتە هەموو سوکایەتییەک و بێ ڕێزییەک قبوڵ بکەیت. گومانیان لەوەدا نەهێشتۆتەوە کە ئەوەی دەیکەن لەسەر حسابی ژیانی ئێستای ئەوانی ترو داهاتووی هەموومانە.
لە کوردستان میللەتەکەیان توشی هەڵوەشان کردووە. ژمارەیەکی زۆر هەرچی ماڵ و سامان و ڕابووردوی هەیە، دەیفرۆشێت و ڕێگای هاتونەهات دەگرێتە بەر. لە دەرەوەی وڵات، ئەو بارە ناهەموارەی ناوەوە، سەرەڕای دەربەدەریی، لە سەر هەر یەکێکمان کەوتووە. جگە لەوەی هیوای گەڕانەوەی خستە چاڵەوە، ناهەمواریی ئابووریی ئەوێ ئابووریی و ژیانی خێزانیی کوردی دەرەوەشی تێک داوەو بۆ ژمارەیەک بۆتە مایەی تەنگوچەڵەمەی گەورە.
میللەتێک بە دەسەڵاتە سیاسیەکەی بە ڕێوە دەچێت و خۆی لە هێرشی دوژمنان دەپارێزێت. لە ڕێگای خەڵکە زانیارەکانیەوە ئاگادار دەکرێتەوەو ڕێگای پیشان دەدرێت. میللەتێکی زیندوو کە کارەساتێکی لێ دەقەومێت چەندەها چارەسەریی و ئەڵتەرناتیف دەخاتە مەیدانەکەوە بۆ ئەوەی جگە لە هەڵسانەوەی ئاکامەکەی، بەر لە دوبارەبونەوەشی بگرێت. میللەتی کورد لە بارێکی مێژوویی وا دژواردایە کە شانبەشانی گەورەبوونی کارەساتەکانی تا هاتووە زیاتر توانای نەهێشتنی هۆی کارەساتەکانی لێ براوە. هەر دەستەیەک خیانەتکارو کەسانی تاوانکاری میللەتەکە نین کە لە جێگای بەڕێوەرانی کۆمەڵ و پارێزانیدا دانیشتوون. ژمارەیەکی زۆریش شەهادەدارو نوسەرو هۆنەرو قسەزانیش لە جیاتی ڕێگای گۆڕانکاریی، بە دەیان شێوە پارێزگاریی لەو بارە دەکەن و هەوڵی مانەوەو بەردەوامبوونی بۆ دەدەن. لە جیاتی ئەوەی بەرامبەر بە هەر تێکشکان و چاوشکاندنێکی میللەتەکە، هێزێکی هەڵسانەوەو جۆرەها بەرەنگاریی بۆ دروست بکەن، دەیان ڕێگای چاوپۆشین و ملکەچیی و بەندێتیی پیشانی خەڵکەکەیان دەدەن. دەنگەکان چەند جیاواز بن و بە گوێرەی گەورەیی و پچوکیی ڕوداوەکان بەرزو نزم بن، بە گشتی لەوەدا یەک دەگرنەوە کە سنوری ئەو خەتە سورە نەشکێنن کە دابونەریتی دەسەڵاتی سیستێمی حیزبەکان و مێژووەکە بۆی داناون. ئەمە ڕێکەوت نیە کە "ڕۆشنبران" لە کاتێکدا لەسەر پچوکترین ڕەخنە کە لە خۆیان بگیرێت، ڕق هەڵگرن و قەڵەمی چاودەرهێنان ببەستن و، لە بەردەمی بچوکترین ئاوڕلێدانەوەی حیزبەکانیشدا، چاویان لە گەورەترین تاوان بنوقێنن، کەچی بڵقەبڵقی خنکانی کۆترە مناڵانی دەریای ئیجە و قوربانیەکانی ئەنفال و هەڵەبجە نەکەن بە مەسەلەیەکی سیاسی. ئەو کولتورەی کە دەسەڵاتەکان و دامودەزگاو "ڕۆشنبران"ی لێ دروست بووە، ئاساییە بە هەموو هاواری شەڕو چەپڵەی تەبایانەوە لە خەتی سکەی مێژووەکە تێ نەپەڕن. ئاساییە تا ئێستا کارەساتە گەورەکانی کورد نەیان توانیوە ئەدیبی گەورە، کەسانی زانیارو نەوەیەکی نوێ بەرهەم بهێنن. مێژوویەک بێ حساب و لێ پرسینەوە، لەسەر هێڵی بەندیی و ملکەچیی بڕوات، بەرهەمەکەی هەر دەبێت خیانەت و غەدرو "ڕۆشبیریک"ی کلۆڵ بێت.
ئەمە هەڵەیەکی ڕونە ئەوانەی نیشتیمانێک دەفرۆشن، ئەوانەش بن کە نیشتیمانەکەش ڕزگار بکەن، ئەو دەسەڵاتانەی کە ڕۆڵەی خەڵکەکە دەخەنە شەڕێکی ناوخۆی خیانییەوە، هەر ئەو دەسەڵاتانە بن کە مرۆڤی کورد بپارێزن و ژیان و دڵنیایی بۆ دابین بکەن، ئەو دەسەڵاتانەی بە دەست داگیرکەرەکانی کوردستانەوە بن، هەر ئەوانەش بن نوێنەری میللەت و مەسەلەکەی بن، ئەو "ڕۆشنبیران"ەی کە خۆیان بەرهەمی حیزبەکانن، هەڵوێستگر بن لەو خراپانەی کە نوێنەرانی کولتورو بیرکردنەوەی خۆیان دەیان کەن.
ئێمە لە بەردەمی ئەو ئەرکە سیاسییەدا نەوەستاوین کە ئەو دەسەڵاتەی ئەمڕۆ چی بکات،، یان لەو کولتورەی کە ئەوانیشی لێ دروست بوون چی دروست بکەین، دەسەڵاتدارەکان ئەوە دەکەن کە تا ئێستا کردوویانەو ئەو کولتورەش هەر ئەوەی لێ دروست دەبێت کە تا ئێستا لێی دروستکراوە. ئەوانەی گفتوگۆ لەسەر ئەوە دەکەن کە سەرکردەی حیزبەکانی باشور چی بکەن، هەر ئەوە پیشان دەدەن کە خۆشیان هەڵگری هەمان کولتورن. ئێمە لە بەردەمی ئەو ئەرکە سیاسیەدا وەستاوین کە هێڵی شەمەندەفەری مێژووەکە وەرچەرخێنین. ئەوانەی نەفەری ئەم مێژووەن، هەر قسەیەکی تر بکەن، جگە لە درۆو سەرلێشێواویی و پەرتبوونی کەسایەتی، هیچ شتێکی تیر ناگەیەنێت. چونکە شەمەندەفەرەکە دیارە لە کوێوە هاتووەو بۆ کوێ دەچێت. ئەوەی کە دەشچێتە حسابەوە کردارو ڕەفتارو هەڵوێستەکانە. ئەو قسە سەوزوسورو فیکریانەی فۆرمی ڕۆحیی بوونێکی ماددی نین، تەنها لە واگۆنەکانی شەمەندەفەرەکەدا دەخۆن و بۆ ئەو نەفەرە ماندووانە دەست دەدەن کە وزەی دابەزینیان پێ نەماوەو پێویستیان بە خۆخەڵەتاندنە.

**1998.05.12**

Contract Number 2 - 1998

کۆنتـــــــــراکت ژماره ( 2 ) ساڵی 1998

# کۆنتــــــــــــراکت



## لەم ژمارەیەدا ئەم بابەت و باسانە دەخوێنیتەوە :



- **مێژووی خوێناوی ئێران بەرامبەر بە کورد، لەگەڵ دەوری حیزبە کوردییەکان لە ( شکستی نەسلی خودموختاری) دا بخوێنەرەوە.**
- تا چ رادەیەک کوردی ڕۆژهەلات، ئێران بەداگیرکەر لەقەڵەم دەدەن و کوردستان بە رزگارکراوی ئاوات دەخوازن؟ کۆنتراکت ئامارێکی لەم بارەیەوە ئامادە کردوە.
- **کێن ئەوانەی لە دەریای ئیجەدا دەخنکێن و هاوارەکانیان بە کەس ناگات؟**
- پەرلەمانی ئینگلتەرە فەرمانی کوشتنی چارلسی پاشایان دا، چونکە ئەو بۆ دامرکاندنەوەی راپەڕینەکانی ناوخۆی ولات، داوای سوپای بێگانەی کرد.
- **ئەو زوڵم و زۆردارانەی میللەت لە دژیان هەستاون، ئەو نمونانە نەبوون کە سوپای دوژمنیان هینابێتە سەر نیشتمانەکەی خۆیان.**
- بۆچی (M16)ی ئینگلیزی گروپی وەفیقی لە دەستەیەک سەربازی عێراقی دروست کرد، دواییش (CIA) پاڵپشتی کرد؟

# ئاو: سەرچاوەی شەڕی داهاتوو

هێمن

**-سەرچاوەی لە سەدا پەنجای ئاوی ڕوباری دیجلە لە کوردستانی خوارووە**

**- لەداهاتوودا، هێرشکردنە سەر سەرچاوەی ئاو تەنیا کارێکی تاکتیکی نابێت، بەڵکو دەبێتە مەبەستی سەرەکیی شەڕەکە**

**- خێزانێکی ئەمەریکیی ڕۆژی 2000 لیتر ئاو، خێزانێکی وڵاتانی سێ (150)ی بەردەکەوێت**

سەربازەکانی ڕژێمی عێراقی، پاش تێکدانی گوندەکانی کوردستان و ڕاگـواسـتنی خـەڵکەکـەبۆچادرگـازۆرەملیـیـەکـانیان سـەرەونگوونکردنیـان، خانووەکانیان دەتەقـاندەوەو کێڵگەکانیـان دەسـووتاند. بۆ ئەوەی کـە بەتەواوەتـی وا لەناوچەکـە بکەن بۆ ژیان دەست نەدات، سەربازەکان کانیەکـنیشیان دەتەقاندەوەو کانییەکان وشکیان دەکرد.

ئاوی ژێر زەوی لەناو بەردی کوناویدا لەژێر زەویدا کۆ دەبێتەوە. بۆئەوەی کـە ئاو لەناو بـەردەکـەدا بمێنێـتــەوە، دەبێت ئەو بەردە کـوناوییـە، چینێک بەردی پیـانەهـێـڵی لەژێردا بێت کـە ڕێگا نەدات ئاوەکـە بۆ قـوڵایی خـۆی بدزێتـەوە. ئەگـەر ئاوێکی زیاتر لە قـەبارەی کونەکانی بەردەکە کۆ ببێتەوە، ئەوا ئاوەکە، کە ڕێگای نییە بۆ قوڵایی بڕوات، ئەگــەر ڕێگای هەبێت، دێتـە سـەر زەوی و کـانی دروست دەبێت. کـانـی ئەو جـێگایـەیە کـە ئاوی ژێر زەوی لێـیـەوە دێتـە سـەر زەوی. کاتێک کـانییەک دەتەقێندرێتـەوە، ئەو بەردە پیانەهێڵەی کە ناهێڵـێت ئاوەکـە خـۆی بدزێتـەوە، درزدەباتو ئەو کـاتە ئاوەکـە لەو درزانەوە خـۆی دەدزێتـەوە بۆ جێگایەکی دیکە. بەو شـێوەیە کانیـەکە وشک دەکات.

سـوپای سـەفـەوی چەند مـانگێک بارەگای لـەدەوری قـەڵای دمـدم خست و نەیتوانی بەهێز دەست بـسـەر قـەڵادا بگرێت. بەڵام کـاتێک بەهـۆی مـەرگـەوەری ناپاکـەوە سـەرچاوەی ئاوی قـەڵای دۆزییـەوەو دەستی بەسەردا گرت، خـەڵکی ئازای قەڵا لەتینواندا خۆیان کوشت بۆ ئەوەی دەستی سـەفەوییەکان نەکەون. قەڵا بەو شێوەیە گیرا.

ئاو لەمێژوودا چەکێکی زۆر گرنگ بووەو لەشەڕدا بەکارهێنراوە بۆ لاوازکردنی لایەنی بەرامبـەر. لەشەڕی بۆسنییەدا، ئەو سێربانەی ئابڵووقـەی سەرایێڤۆیان دابوو، بۆ بێهێزکردنی شارەکە، تاکتیکێکی تازەیان بەکـارهێنا کە زۆر کـاریگەرتربوو لەوەی ڕاستـەوخۆ هێرش بکەنە سـەر شـارەکـە. بە بڕینی خـەتی کـارەبای شـار، سێربەکان توانیـان ئەو پەمپانە لەکار بخـەن کـە ئاوی شـاریان دابەش دەکرد. خـەڵکی شـار لەناچاریدا لـەدەوری بیـرەکـانی شـار ڕیزیان دەگرت بۆ ئاوو دەبوونە نیشـانەیەکی دیار بۆ گوللەو تۆپی سێربەکان. لەشـەڕی (کوێت)یشدا، سوپای عێراقی هەندێک لەو پاڵاوتگایانەیان تەقاندەوە کە ئاوی سوێری دەریایان دەپاڵاوت، بۆ ئاوی خواردنەوە.

دکتۆر ئاگۆستینۆ پاکانینی، کە لە لیژنەی یارمەتی منداڵانی نەتەوە یەکگرتووەکان لە سـۆمـاڵیا کـاردەکات، دەڵێت: "ئاو دەورێکی گـرنگی بینی لە شـەڕی ناوخـۆی سـۆمـاڵیا. ئەوانەی کە لەشـەڕ دەبەزین، بیری ئاوەکانیـان بەبەرد پڕدەکردەوە. لەشـارەکاندا، بۆریو دامودەزگای ئاوو پەمپیان دەدزی. ئێسـتاش بە سەدهـەزاران خـەڵکی ڕاگوێزراو لەبەشی ڕۆژهەڵاتی ئەفریقـادا بێ ئاون. لەسـاڵی (1992)ەوە تا کـۆتایی سـاڵی (1997) کـولێـراو گـەلێک نەخـۆشی دیکە، کـە بەڕێگای ئاوەوە دەگوێزرێنەوە، بەهەزارەها سۆماڵیان کوشتووە"(1).



پاڵاوتگایەکی ئاوی کوێتی کە سەربازە عێراقییەکان، پاش شکانیان لە شەڕی کەنداودا، تێکوپێکیاندا

لەداهـاتوودا، هێـرشکردنە سـەر سـەرچاوەی ئاو تەنیـا کـارێکی تاکتیکی نابێت، بەڵکو دەبێتە مـەبەستی سەرەکیی شـەڕەکە. لەگەڵ زیادبوونی ژمارەی دانیشتوانی جیهان، هـەوڵی دەست بەسەرداگرتنی ئەو ئاوە کـەمـەی جـیـهـان زۆردەبێت و گـەلێک شـەڕی لێدەکەوێتـەوە. لەیەکـێکلەهەرەناوچەحـەسـاسـەکـانیجـیـهـانـدا(ڕۆژهـەڵاتی ناوەڕاست)، شـا(حسێن)ی ئەردەن دەڵێت: "تەنیا ناکۆکی لەسـەر ئاو دەتوانێت ئەو ئاشتییەی نێوان ئەردەنو ئیسرائیل تێک بدات"(1).

هـەرچەندە دوولەسەرسێی ڕووی ئەم ئەستێرە شینە (زەوی) ئاوە، لەسـەدا نەوەدوحـەوتی (97%) ئـەو ئاوە ئاوی سـوێری دەریایـەو بەکـەڵکی خـواردنـەوە نایەت. لەسـەدا دووی (2%) لەبەفـری پۆڵەکـاندا کۆبۆتەوە. ئەو (12600) کیلۆمەتر سێجایەی کە دەمێنێتـەوە، زۆر بە

ناڕێکی دابەش بووە. بۆ نموونە: مرۆڤێکی کەنەدی بیستوشەش ئەوەندەی مەکسیکییەکئاوی بەردەکەوێت.لەراستیدا ئاوی خواردنەوەی زەوی زۆر کەمە. لەو جێگایانەی ئاوەکە زیادە، بەشێوەیەکی ناڕێکوپێک بەکاردەهێندرێت و بەفیڕۆ دەدرێت. بەپێی راپۆرتێکی مانگی چواری نەتەوەیەکگرتووەکانوپەیمانگای ستۆکهۆڵمی ژینگە (Stockholm Environment Institute)، تاساڵی (2025)دوولەسەرسێی دانیشتوانی جیهان تووشی ئاوکەمیی دەبن. لەساڵی (1995)دا لەسەدا بیستی (20%) دانیشتوانی جیهان بێ ئاوی خواردنەوە بوون. لەسەدا پەنجا (50%)شیان بێ ئاودەستخانەی گونجاوبوون. سێر (کریسپن تیکێل)ی وەزیری پێشووی بەریتانیا لەنەتەوەیەکگرتووەکان و یەکێک لە رێکخەرەکانی کۆبوونەوەی زەوی لە ساڵی (1992)دا لە ریۆدێجانیرۆ دەڵێت: "جیهان گیروگرفتێکی زۆر گەورەی ئاوی هەیە. ئاو لەنەوت زیاتر دەبێتە هۆی هەڵگیرساندنی شەڕ"(1).

هەر بیست ساڵەو پێویستیی ئاوی جیهان دووقات زیاد دەکات. بەڵام ئەو میقدارە ئاوەی کە لەبەردەستدایە هەر یەقەدەر ئەو ئاوەیە کە لەسەردەمی رۆمانەکاندا هەبووە. ئەم هاوکێشەیە بەپێی کات لاسەنگ دەبێت و کێشەیەکی گەورە دروستدەکات. رادەی بەکارهێنانی ئاو لەجیهاندا لەساڵی (1950)ەوە تا ساڵی (1990) سێقات زیادیکرد. ئەم زیادبوونە لەنێوان هەژارو دەوڵەمەنددا وەک یەک نەبووە. لەکاتێکدا خێزانێکی ئەمریکی رۆژی (2000) لیتر ئاو بۆ ئاودەست و پاککردنەوە بەکاردەهێنێت، خێزانێکی وڵاتێکی جیهانی سێ (developing country)، رۆژی تەنیا بە (150) لیتر ئاو ژیان بەسەردەبات. زۆرجاریش، بۆ بەدەستهێنانی ئەو شلەمەنییە بەنرخە، دەبێت چەندەها کیلۆمەتر برۆن.

نەوت و ئاو دوو شلەمەنین کە لە پێشبڕکێدان بۆ بردنەوەی ئەو خەڵاتەی کە کامیان گرنگترین و پێویسترین شلەن لەجیهاندا. لەژمارەی رابووردووی ئەم گۆڤارەدا، باسی گرنگی نەوتمان کرد لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا. ئێران و عێراق بەتەنیا لەسەدا بیستی نەوتی دۆزراوەی جیهانیان تێدایە. بەداخەوە، ئەو سەرژمێرە ئەوە دیاری ناکات کە چەند لەو نەوتە کەوتۆتە کوردستانەوە. بەڵام بە هەڵسەنگاندنێکی زۆر سەرپێییانە دەتوانرێت ئەم لێکدانەوەیەی خوارەوە بهێندرێتە بەرهەم:

١-سیان لەچاڵە نەوتە گەورەکانی عێراق (کەرکوک، موسڵ، خانەقین) کەوتوونەتە کوردستانی خوارووەوە. کەرکووکو رومێلە گەورەترین دوو چاڵەنەوتن لە عێراقدا.

٢-کۆمەڵێک چاڵەنەوت لەجێگای دیکەی کوردستاندا هەنو دەستیان لێنەدراوە (بۆ نموونە: تەقتەق، دهۆک).

٣-زۆر جێگای کوردستان هەیە کە تا ئێستا لەبەر بارودۆخی سیاسی نەپشکێندراوە.

٤-عێراق لەرووی جیۆلۆجییەوە کراوە بەسێ بەشەوە: ناوچەی بەردی زۆر لۆچبووی تێکشکاو (Thrust zone)، ناوچەی بەردی بەئاسایی لۆچبوو (Simply folded zone)، و ناوچەی بەردی تەخت (Unfolded zone). دوو ناوچەکەی پێشوو کەوتوونەتە کوردستانی خوارووەوەو چیاکانی حەمرین لە ناوچە تەختاییەکەیان جیادەکاتەوە کە کەوتۆتە عێراقی عەرەبییەوە. ئەو بەردە لۆچبوانەی ناوچەی دووەم پێکهاتەی زۆر لەبار دروستدەکەن بۆ کۆبوونەوەی نەوت. بیرەنەوتی کەرکوک، کە یەکێکە لە گەورەترین بیرەنەوت لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا، بریتییە لە چیایەکی قۆقزیی کە نەوتەکەی تێدا کۆبۆتەوە.

ئەو خاڵانەی سەرەوە ئەوە پیشان دەدەن، کە رێژەیەکی زۆر نەوت کەوتۆتە کوردستانی باشوورەوەو بەئاسانی پێویستی ناوخۆ پڕدەکاتەوە. کوردستان ناوچەیەکی شاخاویشەو هێندێک لە چیاکانی (3550)مەتر لەسەرووی رووی دەریاوەن. کوردستان ئاووهەوای دەریای سپی ناوەڕاستی هەیەو باران و بەفرێکی زۆریشی لێدەبارێت، هەر بۆیە چەند لقێکی سەرەکی رووباری دیجلەو رووباری فورات لەچیاکانی کوردستانەوە هەڵدەقوڵێن. سەرچاوەی لەسەدا پەنجای (50%) ئاوی رووباری دیجلە لەکوردستانی خوارووە. لە نێوان مانگی (11)و (4)دا، (1200) میللیمەتر باران لەکوردستان دەبارێت. لەناوەڕاست و خوارووی عێراقدا، بۆ نموونە، ساڵی تەنیا (100) میللیمەتر باران دەبارێت. کۆمەڵێک گۆمی گەورەش (وان، ورمێ، دوکان، دەربەندیخان، دهۆک) لەکوردستاندا هەن. سەددی دوکان، کە لەسەر زابی بچووک دروستکراوە، (6.8) کیلۆمتر سێجا ئاوو، سەددی دەربەندیخانی سەر رووباری دیالە (5.74) کیلۆمەتر سێجا ئاو دەگرێتەخۆی. سەددی بەخمەش کە لەسەر زابی گەورە درووستکرابوو، (13.18) کیلۆمەتر سێجا ئاوی دەگرتە خۆی (سەدی بەخمەو ونیوونی ئامێرەکانی سەددەکە داستانێکە بۆخۆی و ئێرە جێگای ئەو داستانە نییە). سەرەڕای ئەوەش کوردستان ئاوی ژێرزەوی زۆرەو لەدامێنی چیاکاندا کانیی دروست دەکەن. ئەگەر بەراوورد بکرێت بە ئاوی ژێرزەوی خوارووی عێراق کە خوێی زۆرە، ئاوی ژێرزەوی لەکوردستاندا زۆر خاوێنە. ئاوی ژێرزەوی لەدامێنی چیاکانی کوردستانی خوارووکەتۆتە قووڵایی (5 تا 50) مەترەوەو نزیکەی (10 بۆ 40) مەتر سێجا ئاو لەچرکەیەکدا دەردەدات. ئەو ئاوەی لەکوردستاندا هەیەبەزیادیشەوەپێویستیی ناوخۆ دابیندەکات. ئەگەر کورد خۆی نەتوانێت کۆنترۆڵی خاکی خۆی و سەرچاوە سرووشتییەکانی بکات، ئەو سەرچاوە سرووشتییە بێگومان لەداهاتوویەکی زۆر نزیکدا، گیروگرفتی زۆر لەوانەی نەوت گەورەتری بۆ دروستدەکەن.

رێژەیەکی کەمی ئاوی شیرینی زەوی بۆ خواردنەوەو کاری شەخسی بەکاردەهێنرێت. لەسەدا شەستونۆ (69%)ی ئاوی زەوی بۆ کشتوکاڵ بەکاردەهێندرێت. لەسەدا هەشت (8%)ی بۆ ئیشی ناوماڵ و لەسەدا بیستوسێش (23%)ی لەپیشەسازیدا بەکاردەهێندرێت (1). لەجیهاندا، باران زۆرترین پێویستیی ئاو بۆ کشتوکاڵ دابیندەکات. بۆیە ئەو جێگایانەی کە بارانیان زۆر لێدەبارێت پێویستیی ئاویان تا رادەیەکی زۆر مەیسەر دەبێت. باران ناهێڵێت رووبارو دەریاچەکان (گۆمەکان)ووشکبکەن.ئەگەرئەوهەوایەی بارانەکەی لێدروستدەبێت پیس نەبێت، باران سەرچاوەیەکی گرنگی ئاوی خواردنەوەیە و هەرزانترین پرۆسێسە کە بەشێوەیەکی سرووشتی ئاوی سوێری دەریاکان دەپاڵێوێت بۆئاوی شیرین. لەکوێت، بەدەستهێنانی هەزارلیتر ئاوی شیرین لەرێگای پاڵاوتنی ئاوی سوێری دەریاوە، دوو دۆلار دەکەوێت.

نیشانەکانی کەمیی ئاو لەزۆر شوێندا ئاشکراو لەبەرچاوە. لەهەموو جیهاندا، ئاستی ئاوی ژێرزەوی (water table) نزم دەبێتەوەو خەزانەی ئاوی ژێرزەوی کەمدەبێتەوە، گۆمەکان بچووکدەبنەوەو زەوی بەپیت، کە مەرجێکی سەرەکییە بۆ رووەکو ئاژەڵ، وشکدەکات. زیاتر لە (38000) سەددی گەورە (یەکی بەلایەنی کەمەوە 15 مەتر بەرز)و چەند سەددێکی بچووکی لەژمارەنەهاتووبەر لەئاوی رووبارو جۆگەکان دەگرن. هێندێک لەرووبارە گەورەکانی جیهان (کۆلۆرادۆ لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاو رووباری زەرد لە چین) ئەوەندەیان سەدد لەسەر دروستکراوەو لقیان لێکراوەتەوە کە ئاوێکی زۆر کەمیان دەگەنە دەریاکان.

هێندێک وڵات سوود لەئاوی دەریا دەبینن و دەیپاڵێون بۆ ئاوی شیرین. هێندێک لەو پاڵاوتگایانەی کە ئاوی سوێر دەگۆڕن بۆ ئاوی شیرین بە خۆر ئیشدەکەن. بەڵام ڕێژەیەکی زۆر کەم ئاو دەپاڵێون. بۆیە لەو وڵاتانەی کە نەوتیان زۆرە (وەک سعودیە) ئەم پاڵاوتگایانە بە نەوت ئیشدەکەن و میقدارێکی زۆر ئاو دەپاڵێون. لە جیهاندا (7563) پاڵاوتگای گەورەی ئاو هەیە کە هەر یەکەیان رۆژی زیاتر لە (100) مەتر سێجا ئاو بەڕێگای دڵۆپاندن (distillation) دەپاڵێون (3). یەکێک لە گەورەترین پاڵاوتگاکانی ئاو کەوتۆتە شاری (جوبەیل)ی سعودیەوە کە رۆژی یەک ملیۆن مەتر سێجا ئاو دەپاڵێوێت. ئەو بیستودوو پاڵاوتگا گەورەیەی لە سعودیەدا هەن لەسەدا سی (30%) ئاوی پاڵێوراوی جیهان بەرهەم دەهێنن. سعودیە، یەکەم وڵاتیشە لەدەرهێنانی ئاوی کۆن لە جیهاندا. ئاوی کۆن، کە بە ئینگلیزی پێیدەوترێت فۆسیل وۆتەر (fossil water)، ئەو ئاوەیە کە ملیۆنەها ساڵ لە زەویدا لەناو بەرددا کۆبۆتەوە بێ ئەوەی لەگەڵ ئاوی تازەدا تێکەڵ بووبێت. بەبەکارهێنانی ئەو هەموو ئاوە، سعودیە کە بەشێکی زۆری خاکەکەی بیابانە، ئەمڕۆ حەوتەم گەورەترین وڵاتە لە ناردنەدەرەوەی گەنمدا (2). پاش بەزینیان، سوپای عێراقی دوو پاڵاوتگای گەورەی (کوێت)یان وێرانکرد. ئێستا چوار پاڵاوتگای ئاو لە کوێت رۆژی ئەوەندەو نیوی پێویستی وڵات ئاو دەپاڵێون.

بەشێکی گەورەی گیروگرفتی ئاوی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست لەوەدایە کە ئاوەکە بەناڕێکوپێکی دابەش بووە. لەساڵی (1990)دا، ئەمریکییەک ساڵی (10,000) مەتر سێجا ئاوی بەردەکەوت. لەهەمان ساڵدا، عێراقییەک (5500) مەتر سێجاو تورکییەک (4000)، سورییەک (2800)، میسرییەک (1100)، ئیسرائیلییەک (460)و ئەردەنییەک (260) مەتر سێجا ئاوی بەردەکەوت. شارەزایانی ئاو دەڵێن ئەگەر وڵاتەکانی ناوچەکە ئاوەکە بەش بکەنو لە رووی تەکنۆلۆجیاوە یارمەتی یەکدی بدەن، ئەوا بەئاسانی پێویستی ئاو بۆ هەموو دانیشتوانی ناوچەکە، کە نزیکەی (159) ملیۆنە، دابین دەکرێت. بەڵام وڵاتانی ناوچەکە ئاووەک چەکێک بەکاردەهێنن بۆ بەدەستهێنانی مەرامی سیاسی خۆیان. هێندێکلە

**نەخشەیەکی کوردستان و دەوروبەری کە لقە سەرەکییەکانی دیجلەو فورات و سەددەکانی سەر ئەو دوو ڕوبارە پیشان دەدەن.**

پسپۆڕەکانی ئاو دەڵێن پاککردنەوەی ئاوی دەریا لە پاڵاوتگاکاندا لە قازانجی هەموو وڵاتانی ناوچەکەیە. بۆ نموونە، دابینکردنی پێویستی ئاوی بەرەی رۆژئاوا و ئیسرائیل و ئەردەن پێکەوە کەمتر لە دە (10) ملیارد دۆلار دەکەوێت. شەڕی کەنداو، بۆ رزگارکردنی کوێت، چوارسەدوسی (430) ملیارد دۆلار کەوت لەسەر وڵاتە عەرەبییەکان[2].

لەساڵی (1987)دا، تورکیا پێشنیاری دروستکردنی "بۆری ئاشتی" کرد بۆ گواستنەوەی ئاوی دوو رووباری (Ceyhan) و (Seyhan)ی تورکی کە دەڕژێنە دەریای سپی ناوەڕاستەوە. بڕیار وابوو ئەم دوو بۆرییە ئاوی خواردنەوە بگوێزنەوە بۆ ملیۆنەها کەس لە سوریاو ئەردەن و سعودیەو وڵاتەکانی دیکەی کەنداو. چەند وڵاتێکی کەم بەدەنگ ئەم پرۆژەیەوە چوون و پرۆژەکە پشتگوێ خرا. ئەمڕۆ بیستودوو سەدد لەسەر رووباری دیجلەو فورات دروست کراوە. سەددی ئەتاتورک، کە کەوتۆتە شەستوچوار کیلۆمەتر لەسەرووی شاری (Urfa)وە، بەشێکە لە پرۆژەی خوارووی رۆژهەڵاتی ئەنازۆڵ. ئەم سەددە ئاوی رووباری فورات بە دوو لە گەورەترین کەناڵی ئاو لە جیهاندا (کەهەریەکەیان تیرەکەیان حەوت مەترونیوە) شەستوچوار (64) کیلۆمەتر دەگوێزنەوە بۆ دەشتی (Harran). لەساڵی (1989)دا تورگوت ئوزالی سەرەککۆماری ئەو کاتەی تورکیا بە عێراقو سوریای راگەیاند کە بۆ پڕکردنی سەددەکە ئاوی رووباری فورات کەمدەکەنەوە. بۆئەوەی عێراقو سوریا ناڕەزایی دەرنەبڕن، تورکیا بۆ دوو مانگ میقداری ئاوەکەی زیادکرد بۆ ئەوەی هەقی ئەو کەمکردنەوەیان بۆ بکاتەوە. بەتەواوبوونی پرۆژەی ئەنازۆڵ، ئاوی رووباری فورات لەسەدا شەست (60%) کەمدەکات. ئەمە زیانێکی گەورە بە کشتوکاڵ لە عێراقو سوریا دەگەیەنێت. عێراقو سوریا چەندەها جار ناڕەزاییان دەربڕیوە دەربارەی کەمبوونەوەی ئاوی رووباری فورات. لەساڵی (1993)دا سەرۆکی وەفدی تورکی (یشار یقیش) لە لیژنەی ئاو لەگەڵ عێراقو سوریادا رایگەیاند کە تورکیا ئاوەکە لەسەر بناغەیەکی زانستی لەگەڵ عێراقو سوریادا بەشدەکات. ئەو پێشنیارەی تورکیا بەسەر سێ قۆناغدا دابەش بووبوو: یەکەم، مەسحێکی سەرچاوە ئاوییەکان، دووەم، دراسەی زەوی و سێهەم هەڵسەنگاندنی سەرچاوە ئاوییەکانو ئەرزەکان. سوریا ئەم

پێشنیارەی رەتکردەوە. وەفدی سوریی (دەرویش) هۆی ناکۆکی ئاوی نێوان سوریاو تورکیا دەگەڕێنێتەوە بۆ ئەوەی کە ئەو ئاوەی لە رووباری فورات دەگاتە سوریا بەشی پێویستییەکانی سوریا ناکات، بەتایبەتیش کاتێک کە هێندێک لە ئاوەکە دەچێت بۆ عێراق. بۆیە سوریا داوای زیادکردنی ئاوەی رووباری فورات دەکات لە (500) بۆ (750) مەتر سێجا لە چرکەیەکدا. لەوەڵامدا تورکیا دەڵێت "هۆی گیروگرفتەکە ئەوەیە کە سوریا داوای میقدارێکی زیاتر لە ئاو دەکات لەوەی کە رووباری فورات هەیەتی، جا تورکیا لەکوێ ئەو ئاوە زیادە بهێنێت بۆ سوریا". تورکیا دەڵێت: "سوریا داوای (11,3) ملیارد مەتر سێجا دەکات و عێراق (23) ملیاردو تورکیاش (18) ملیارد مەتر سێجای دەوێت. کۆی ئەو میقدارانە لەو ئاوە زیاترە کە لە حەوزی رووباری فوراتدا (کە 32 ملیارد مەتر سێجایە) هەیە". بەقسەی تورکیا لەسەدا حەفتاوپێنجی (75%) ئاوەکە دەچێت بۆ عێراقو سوریا، تورکیا خۆی تەنیا لەسەدا سی (30%) بۆ دەمێنێتەوە(4). گیروگرفتی ئاو لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا تەنیا لەنێوان ئەم سێ دەوڵەتەدا نییە. ئیسرائیل و لوبنان و سوریاو ئەردەن و فەلەستینیش لەسەر ئاو لە کێشەیەکی بەردەوامدان. لەساڵی (1967)دا ئیسڕائیل بۆمبارانی سەدێکی کرد لەسەر رووباری (یەرمووک) کە سوریاو ئەردەن بەکاریان دەهێنا. لەساڵی (1975)دا عێراق و سوریا ئەوەندەی نەمابوو بکەونە شەڕ پاش ئەوەی سوریاو تورکیا، بۆپڕکردنی سەددەکانیان، میقداری ئاو رووباری فوراتیان کەمکردەوە. لەم چەند ساڵانەی دواییدا، فەلەستینی و ئیسڕائیلییەکان مشتومڕیانە لەسەر ئەوەی کە ئاوی ژێر زەوی لە بەرەی رۆژئاوا (west bank)دا کەمیکردووە. میسر، کە هەموو پێویستی ئاوی خۆی لە رووباری نیلەوە دابیندەکات، لەوە دەترسێت وڵاتەکانی دیکەی سەر رووباری نیل داوای میقدارێکی زیاتر لە ئاوی رووبارەکە بکەن. بەرزاییەکانی جۆلان تەنیا گرنگی سەربازییان نییە، بەڵکو سەرچاوەیەکی گرنگی ئاویشن بۆیە ئیسڕائیل وا بەئاسانی نایداتەوە بە سوریا. وەزیری دەرەوەی میسری (بوتروس غالی) لەساڵی (1985)دا وتی "شەڕی داهاتوو لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا لەسەر ئاو دەبێت نەک لەسەر سیاسەت". کوردوسەرچاوەئاوییەکەی دەکەوێتەچوبەشێکی ئەو بەربەرەکانییەوە، تەنیا پەیوەندی بەوەوە هەیە کە کورد خۆی تا چرادەیەک خاوەنی سیاسەتێکی خۆماڵییە کە بتوانێت جێگایەکی بۆ دابین بکات لەسەر مێزی دانیشتن دەربارەی گیروگرفتی ئاوی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست.

**سەرچاوەکان:**


1. Priit J. Vesilind, 1993. The Middle East's water critical resources. National Geographic, Volume 183 (5), p. 38-73.
2. Michael S. Serrill, 1997. Not enough drops to drink. Time (Special Volume), Volume 150 (17A), 16-21.
3. The Open University, 1995. Water resources. Physical Resources and Environment, Block 5., 150pp.
٤. سوسن ابو حسين. الشرق الاوسط تابعت ملف المياه بين سوريه والعراقوتركيا ١٩٩٧ الشرق الاوسط.



## سوپاس

سوپاس بۆ هەموو ئەو کەسانەی کە بەدەنگ ژمارە یەکی "کۆنتراکت" ەوە هاتن، وەڵامی بەشداریی، یارمەتی، نامە، ڕاو بۆچون و سەرنجیان بۆ ناردین. ئەگەر "کۆنتراکت" دەنگی تۆیە:
- کەمتەرخەمیی مەکە! بەردەوامبوونی هاریکاریی تۆ بڕیاری لەسەر دەدات.
- ڕاو بۆچون و سەرنجەکانت بنێرە!
- لە هەمووی گرنگتر:

**هەر کاتێک بارەرت پێی نەما بیخەرە تەنەکەی خۆڵەوە!**


## چەند راستییەک دەربارەی ئاو



١ـ ئاو سەرچاوەیەکە کە تازەدەبێتەوە. بەشێکی زۆری ئەو ئاوەی بۆ خۆشۆردن و کشتوکاڵ بەکاردەهێندرێن، لەڕێگای بارانەوە یان کانییەکانەوەدێنەوەبەردەست. ئەسترۆنۆمەکان مێزی خۆیان دەپاڵێون و ئاوە بەرهەمەکەی دەخۆنەوە.

٢ـ هەرنەفەرێک رۆژی چەند لیترێک ئاوی بەسە بۆ ئەوەی نەمرێت. بۆ هەموو پێویستییەکانی رۆژانە (ئاوی خواردنەوەو چێشتلێنان و خۆشۆردن) هەر نەفەرێک رۆژی (20 تا 40) لیتر ئاوی پێویست دەبێت.

٣ـ لەسەدا شەستونۆ (69%)ی ئاوی زەوی بۆ کشتوکاڵ بەکاردەهێندرێت. لەسەدا هەشت (8%)ی بۆ ئیشی ناوماڵ و لەسەدا بیستوسێش (23%)ی لەپیشەسازیدا بەکاردەهێندرێت.

٤ـ لەبەریتانیا، ئاو هەرزانترین سەرچاوەی سرووشتییە. لەساڵی (1993)دا یەک تەن (هەزار کیلۆ) ئاو بە (53) پێنس (6 دۆلار) بوو.

٥ـ هەزار لیتر ئاوی خواردنەوە، کە بەپاڵاوتنی ئاوی دەریا بەدەستدەهات، دوو دۆلار دەکەوت لەسەر کرێت. لە شیکاگۆ، ئەو هەزار لیترە تەنیا (20) سێنت دەکەوێت.

## دوای ڕزگاربوونی کێشەی نەتەوەیی:

# دوو ســـــــیمای سیاســـــــی گرنـــــــگ

نووسینی :
**ئیسماعیل بیشکچی**
گۆڕینی لە کرمانجییەوە :
**مەهاباد کوردی**


ئیسماعیل بیشکچی

پێویسـتە ئامـانجی بنچینـەیی خەبـاتی سیاســی و کۆمەڵایـەتی لە کوردستاندا، دامەزراندن و پێشخستنی دیموکراسی بێت. ئـەم خاڵە بۆ کـوردان گـەلێک گرنگـە چونکـە کۆمەڵگای کـوردەواری کۆمەڵگایـەکی وەهایە، ژیانی دیموکراسی بە خۆیەوە نەدیوە. سیستێمی کۆلۆنیالیزمی نێو دەوڵەتـان، هەرچییەکیـان لە دەسـت هـاتبێ بـۆ بەرقـەرار نـەبوونی دیموکراسی لە کوردستاندا، کردویانـە. دەوڵەتـانی کۆلۆنیالیست، بـۆ ئەوەی بتوانن پێش لە بەر بزووتنەوەی ڕزگاری نەتەوەیی کـورد بگـرن، کەوتونەتە هاوکاری کردن دەگەڵ دەزگا فیوداڵیەکاندا.

دەوڵەتانی داگیرکەر لە هەوڵێکی مەزندان لەپێناو بەزیندووڕاگرتنی ئـەو دامودەزگا فیودالـی و دەرەبەگیانـە. هـەوڵی سیاسیانەی " پەرتکـەو زالبـە"( فـرق تسـد ) لە خۆیـدا کۆسـپێکە لە بـەردەم پێشکـەوتن و دامەزراندنی دیموکراسی دا.

دەبێـت بزوتنـەوە ڕزگاریخوازییـە نەتەوەییەکـان لە ڕووی نـاوەڕۆکی دیموکراتییانـەوە شـی بکرینـەوە . لەم مـژارەدا جگـە لە نمونەکـانی هیندسـتان و ئیسرائیل، هێنانـەوەی نمونەکـانی کۆنگـۆ، سـەنیگال و ئۆگەنداش شیکردنەوەیان سوودبەخش دەبێت. هیندستان و ئیسـرائیل، دوای جەنگی جیهانی دووەم بوونە دوو دەوڵەتی سەربەخۆ. هیندسـتان کۆلۆنی ئینگلیزەکان بوو. لە سەرەتای سەدەی بیستەمەوە هیندستان لە شەڕی سەربەخۆبوونی خـۆی دژی کۆلۆنیالیستە ئینگلیزەکـان کرد. ئەم شەڕە لە دوای جەنگی جیهانی یەکەم بەگوڕتر بەردەوام بوو.

بەر لە جـەنگی جیهانی دووەم و لە کـاتی جـەنگیشدا، شـەڕی ڕزگاریی هیندستان بـە بەردەوامییـەوە ڕووی لە فـراوان بـوون دەکـرد. خەبـاتی ڕزگاری نەتەوەیی، بەپێشـەنگی پـارتی کۆنگـرە، بەڕێوە دەبـرا. بـەڵام خەڵکانێکی خاوەن بۆچونی جیاجیاش لە تێکۆشانی ڕزگاری نەتەوەییدا جێی خۆیان کردبووەوە. کاتێک لە ( **15** )ی ئـابی ( **1947** ) دا، خەبـاتی سـەربەخۆیی هیندسـتان سـەرکەوتنی وەدەسـت هێنـا، تەنیا کەسێک یاخود تەنیـا بۆچونێک نەهاتـە سـەرحوکم. بەواتایەکی تـر حوکمڕانـی نەکەوتە ژێر تاکـە کـەس یـان تاکـە بۆچونێکـەوە، بـەڵکو کوالیسـونێک (هاوپەیمانتیەک) پێک هات، کـە کەسانی وەک گـاندی و نـەهرۆ لەنێـو بزوتنەوەی ڕزگاری نەتەوەیی هیندستاندا سەنگینەیەکی تەواویان لەنـاو ئـەم کوالیسونەدا هـەبوو. ئـەم کوالیسـونەش لە دامــەزراندن و بــەرەو پێشـەوە بردنـی دیموکراسـیدا ڕۆڵێکـی مــەزنی بینـی، بــۆ نمونــە کۆمۆنیستەکانیش لە ناویدا جێی خۆیان گرت.

ئەوەشمان نـابێت لەبیر بچێـت، کـە لە هیندسـتان هیـچ جارێک پـارتی کۆمۆنیسـت نائاسـایی نـەبووە. لەپرۆسـەی ڕزگـاربوونی هیندسـتانیشدا کۆمیونیســتەکان هاوکارییــەکی بەرچاویــان ئەنجــام داوە. ئــەمڕۆ هیندستان دەوڵەتێکی دیموکراسییە. بێگومان هیندییەکـان کـەموکوڕی زۆریشیان لە بواری دیموکراسیدا هەیـە. لە سـەروی هەموانـەوەش، تـا ئێستاش هیندیەکان عەودالی ناوێکی وەکو "گـاندی"ن، بـەڵام ئاشکرایـە کە هـێزە دیموکراسیەکان هەستیان بەم دژواری و سـەختییە کـردوەو دەشزانـن پاشـەڕۆژ چـی چاوەڕوانیـان دەکـات. ئــەم زانینــەش لە چارەسەرکردنی تەنگوچەڵەمەکاندا دەبێتە هێزێکی بنچینەیی.

شیکردنـەوەی خەبات و تێکۆشـانی جولەکەکـانیش بـۆ دامــەزراندنی دەوڵەتێکی جولەکە لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا کارێکی باش و بەکەڵکە. ئــەم خەبـات و تێکۆشانـەش لە کوالیسـیۆنێکەوە چەکـەرەی کــردو پێگەیشت. جولەکەکان کـە خـاوەنی گـەلێک بیروبـاوەڕی جیـاواز بـوون گشتیان لە ناو ئەم کوالیسونەدا کۆ بووبوونەوە. ئەو هێزە سیاسیانەی لە لایــەن وایزمــان، بــەن گۆریــون، گۆڵدامـیر و ماناهــــام بێگینـــەوە نوێنەرایەتیان دەکرا، لە ناوکوالیسیۆنەکەدا بەشدار بوون.

لە ( **14** )مایسـی ( **1948** ) دا، کـاتێک ئیسـرائیل بــووە دەوڵــەتێکی سەربەخۆ. کوالیسـیۆنێک هاتــە سـەر حوکـم، کـە چ لە دامــەزراندنی دەوڵەتێکی دیموکراتی وەک ئیسرائیل و چ لە پەرەپێدان و پێشخستنی دیموکراسی لە ئیسرائیلدا، ڕۆڵێکی گەورەی گێڕاوە.

## دوژمنــداری کردنـی ئیسـرائیل هیـچ سـوودێکی ئەوتۆی نابێت

شتێکی زۆر چاکە ئەگـەر کـوردو بەتایبـەتیش ( پ.ک.ک. )، پرۆسـەی دامــەزراندنی ئیسـرائیل و هیندسـتان و ئــەو ڕووداوانــەی کــە دوای دامەزراندنی ئەم وڵاتانە بەسەریاندا هات، بخەنە بەرچاو و کەڵکیان لـێ وەربگــرن و بــەوردیش شیبیــان بکەنــەوە، چونکــە ( پ.ک.ک. ) بەنادیموکرات، تاکڕەوی و کەللەڕەقیی و بە خولقاندنی کۆمەڵگایـەکی

ڕەق و وشک ناوانبار دەکرێت. پێویستە (پ.ک.ک.) لەم بوارەدا هەوڵ بدات باوەڕو متمانە لای کۆمەلانی خەلک پەیدا بکات و هەموو چین و توێژەکانی کۆمەلگای کوردەواری بگرێتە خۆی. کۆمەلگای کوردەواری (کۆمەلگای کوردان) هەرگیز دیموکراسی بە خۆیەوە نەدیوەو لەم بوارەشدا چ هەلیکیان بۆ هەلنەکەوتووە. بۆیە ئەم جۆرە لێکۆڵینەوانە بۆ کوردان پێویستە.

دوژمنایەتی کردنی ئیسرائیل لە لایەن کوردەوە، لە ڕۆژهەلاتی ناوەڕاستدا، لەژێر کاریگەری شۆڤینیزمی عەرەبدا، چ سودیکی ئەوتۆی نابێت. کوردان بۆیان هەیە پەیوەندی بەهێز بکەن دەگەل کۆمەلگای جولەکاندا. کورد نابێت چاو لەدامودەزگا دیموکراتییەکانی ئیسرائیل بپۆشێ. کۆمەلگای جولەکان هاوکاری سروشتی کۆمەلگای کوردانن.

بە پێچەوانەی ئەو نمونانەی سەرەوە کە باس کران، بۆمان هەیە چەند شێوەی سیاسی دیکە بهێنینەوە. لەوە ولاتە ئەفریقییەکان کە دوای شەڕی ڕزگاری نەتەوەیی، بوونە دەولەتی سەربەخۆ. ولاتە ئەفەریقییەکان، لە پاش جەنگی جیهانی دووەم و بەتایبەتیش لە دوای شەستەکان، ئازادی خۆیان بەدەست هێنا. بۆ نمونە کۆنگۆ، لە (15)ی ئابی(1960) دا، سەنیگال لە (20)ی حوزەیرانی (1960)دا، ئۆگەندا لە (9)ی تشرینی یەکەمی(1962)دا سەربەخۆیی خۆیان وە دەست هێنا. وولاتانی وەک گانا، تەنزانیا، مالی، تۆنگۆ، سۆمال، نیجیریاو چادیش کەم تا زۆر، هەر لەو دەمەدا ڕزگاریان بوو. بەلام لەم ولاتانەدا، دوای ئازادبونیان، ڕژێمی دیموکراتی جێی نەبووەوە. لەم ولاتانەدا ڕزگاری نەتەوەیی بە دانوستان لەگەل دەولەتە کۆلۆنیالیستەکاندا بەرقەرار بوون. لەم پرۆسەیەشدا زیاتر خێل و عەشیرەتەکان ڕۆلی گەورەیان بینی. لە ناو خێل و هێزە سیاسیەکانی ئەم ولاتانەدا کوالیسون چ بوونیکی نەبوو. دوای ڕزگاربوونی نەتەوەیی، خێلێکی دەستەلاتدار دەستی دەکرد بەزۆرداریکردن لە گەلەکەی خۆی. چەند جار ئەو زولم و زۆرداریانەی ئەم ڕژێمانە پێی ڕادەبوون، گەلێک لە زولم و زۆرداریی ئیمپریالیست و داگیرکەرەکانیش زیاتر بوو. لەم ولاتانەدا، چ لە سەردەمی ڕزگاری نەتەوەییداو چ لەدوای ڕزگاربوونیش، بە هۆی نەبوونی پرۆسە دیموکراتییەکان، ئەنجام گەلەکانیان بە ئێش و ئازارەوە دەژیان.

کوردان جگە لە هەردوو نمونەکانی ئیسرائیل و هیندستان، دەبێت لەسەر نمونەکانی ئەفریقاش هەلویست وەربگرن و لێکیان بدەنەوە. کورد دەبێت لە هەولی ئەوەدا بن ڕێ و ڕێبازی دامەزراندنی کۆمەلگایەکی دیموکراتی بدۆزنەوە. بێگومان شەڕی ڕزگاری نەتەوەیی کوردستان، کە بە ڕابەری و پێشەنگی پارتی کریکارانی کوردستانە، لە می ولاتە ئەفریقیکان زۆر پێشکەوتووترە، بۆ یەکەم لە باکوری کوردستاندا دامەزراوە، هەول بدرێ گیانی خێلایەتی نەمێنێ و لەناو بچن،بەڕێکخستنی جەماوەری گەلی کورد بنکەو بنچینەی چینایەتی دیتە پێشەوە. لە بواری ڕێکخستندا، بیروباوەڕە نووژەنەکان لە پلەی یەکەمدان. بەلام دیسانیش لێکۆلینەوەو تۆژینەوەی ئەو نمونانەی سەرەوە سودبەخش دەبێت.

## دەوڵەتی پاشەڕۆژی فەلەستینیەکان، وەکو دەوڵەتانی ئیستای عەرەبەکان خاسییەتی تاکڕەوی و دیکتاتۆریانەی بەسەردا زاڵ نابێت

مرۆڤ پێویستە لە مۆدیلی فەلەستینەکانیش بکۆلێتەوە. ئاشکرایە خودی فەلەستینیەکان، ئیسرائیلیان بۆ خۆیان کردۆتە مۆدیل. لە نێو فەلەستینیکانیشدا مۆدیلی سیستیمێکی سیاسی پلۆڕال هەیە. ئەو بۆچوونە جیاوازانەی کە لەنێو کۆمەلگای فەلەستینیاندا هەن، لە ناو ڕێکخراوی ڕزگاریخوازی فەلەستینیشدا ڕەنگ دەدەنەوە. ئەمرۆ فەلەستینیەکان لەسەر ئاستی نێو نەتەوەییدا بە تاکە ڕێکخراوێک نوێنەرایەتیان دەکرێت. بێگومان وەها ڕەوشتێک، لەسەر ئاستی نێو نەتەوەییدا بۆ ناساندن و بەرەو پێشەوەبردنی پرسی فەلەستینیکان، خاوەن جێگایەکی مەزنە. شتێکی دیکەش کە هەر هەمان بایەخی هەیە ئەوەیە کە هەموان لەناو ڕێکخستنێکدا کۆبونەتەوە،ئەمەش خۆی لە خۆیدا پرۆسەی پەیوەندی دانان بە کۆمەل و دیموکراتیانەیە. لە ئیستاوە دەتوانرێت بوترێت کە دەولەتی پاشەڕۆژی فەلەستینیەکان، دەبێتە دەولەتێکی دیموکراتی، ئەم دەولەتە وەکو دەولەتانی ئیستای عەرەبەکان خاسییەتی تاکڕەوی و دیکتاتۆریانەی بەسەردا زاڵ نابێت. لەبەر ئەوە ئەم پەیوەندییە دیموکراتیانەی کە هەن لە ناو تێکۆشانی ڕزگاریخوازانەی نەتەوەیی فەلەستیندا، کاریکی گەورە دەکەنە سەر دامەزراندنی دەولەتی فەلەستینەکان کە لە دوا ڕۆژدا پێک بێت.

لەبەر ئەوەی کوردستان پارچە پارچە و دابەش کراوە، پێشبینی ئەوە ناکرێت کوردەکان لە ماوەیەکی کەمدا بتوانن، ڕێکخستنێکی وەها دابمەزرێنن، بەلام گەلی کوردیش دەستی بەم پرۆسەیە کردوەو بە خورتی خوازیاری وەها ڕێکخراوێکە، بەهێزێکی زۆریشەوە هەست بەم پێویستییە دەکات.

گومانی تێدا نییە ئەم داخوازیی و هەست کردنەش، لەم بوارەدا، پێشکەوتنێکی زۆر مەزنە. ئەم ڕەوشە بە ئاشکرا خۆی دەردەخات، ئەگەر کورد لە ڕۆژهەلاتی ناوەڕاستدا نەبنە هێزێکی سەربازی و سیاسی، هیچ دەولەتێکی داگیرکەر حسابێکیان بۆ ناکات. هەلبەتە دامەزراندنی هێزێکی سیاسی شتێکی گرنگە، بەلام ئەگەر هێزێکی سەربازییان نەبێت، ناتوانن هێزی سیاسی دامەزرێنن. پێکهێنانی هێزی سیاسی لە کوردستاندا بەستراوە بە پێشکەوتنی هێزی لەشکریەوە.

هێزی سیاسیش پێویستە بۆ دامەزراندن و بەرەو پێشەوەبردنی دیموکراسی هەوڵ بدات..

سەرچاوە: ئیسماعیل بیشکچی ، چەند گۆتن ل سەر ڕووناکبیرین کورد ، ستۆکهۆلم/ ئاداری 1992 ( کرمانجی سەرو )



<u>ئیسماعیل بێشکچی</u> لە ساڵی (1939) لە گوندی ئیسکلپ دێتە دنیاوە. لە ساڵی (1962) کولێجی زانست/بەشی سیاسەت تەواو دەکات. بۆ ماوەیەکی کورت وەکو کارمەند کاردەکات. لە کاتی تەواوکردنی خزمەتی سەربازی لە کوردستاندا بەباشی ئاشنایی کوردو کۆمەڵگای کوردەواری دەبێت. لە ساڵی(1962)،لە ئەرزڕۆم، لە زانکۆی ئەتاتورك وەکو جێگر دەست بەکار دەکات. لەساڵی 1967دا بەڵگەنامەی دوکتۆرای پێدەدرێت.

لەنێوان ساڵانی 1964-1967دا،لە ئەرزەڕوم و لە زوربەی شارەکانی کوردستاندا بەناوی (کۆبونەوەکانی ڕۆژهەڵات) خۆپیشاندان سازدەکرێن. ئیسماعیل بێشکچیش بەشداری ئەو خۆپیشاندانانە دەکات. لەسەر ئەو خۆپیشاندانانە لێکۆڵینەوەی کۆمەلایەتی ئەنجام دەدات. لەساڵی 1969 بە نێوی(دەستگای ڕۆژهەلاتی ئەنادۆڵ،باری کۆمەلایەتی-ئابوری وبنچینەی ڕەگەزایەتی)یەوە پەرتوکێك بە چاپ دەگەیەنێت،لە سەر ئەم نووسینە لە زانکۆ دەردەکرێت.
بێشکچی لەبەرنووسین و بۆچوونەکانی خۆی لەمەڕ کوردان، ساڵی 1971 زیندان دەکرێت و زیاتر لە سێ ساڵ لەگرتوخانەدا دەمێنێتەوە. لەساڵی 1971 بەر لێبوردنی گشتی دەکەوێت و ئازاد دەبێت.هەر لەبەرئەم بۆچوون وبیروڕایانەی خۆی وانەوتنەوەو کارکردنی لە زانکۆ لێ قەدەغە دەکرێت. بەلام لەگەڵ ئەمانەشدا واز ناهێنێ و بەشێوەیەکی زانستیانە چ بە قسەکردن و چ بە کردەوە چالاکییەکانی خۆی دەردەبڕێت، دەست بەخەباتێکی گرنگ و هێژا دەکات.
لە ساڵی 1979دا جارێکی تر دەگیرێ و لە زینداندا توند دەکرێتەوە. ساڵی 1980 لە زیندانی (تۆپتامش)دا نامەیەك بۆ سەرۆکی نوسەرانی سویسرا دەنێرێت. ئەو لە نامەی خۆی دا باسی ئایدۆلۆژیای کەمالیستانی کردوە.
ئیسماعیل بێشکچی لەنێوان ساڵانی 1981-1987دا بۆ ماوەی شەش ساڵ لە گرتوخانە دەمێنێتەوە. داواکاری گشتی سەر بەدەوڵەت مانگانە فایلێکی نوێی بۆ دەکەنەوە. بە کورتی ئەم مرۆڤە مەزنە مانگێك لە دەرەوە و مانگێك لە ژورەوەیە.
ئیسماعیل بێشکچی بۆ نمونە ئیستاش لە زینداندایە.

ژمارە 1و 2 ی گۆڤاری کۆنتراکت بەچاپکراوی لەسەر (CD) بۆ کۆمپیوتەری (PC) ئامادە کراوە.
هەرکەسێك دەیەوێت دەتوانێت داوای بکات. نرخی هەر دانەیەك سەد کرۆنی سویدییە واتە (25) دۆلارە.



# له کرده‌وه‌دا هه‌ر کوردســـــتان گۆمی خوێن بوو



ئایا مارکسیزم -لینینیزم ئێستا ئه‌لترناتیڤه بۆچاره‌سه‌رکردنی مه‌سه‌له‌ی نه‌ته‌وه‌ی کورد؟!

**پ1 : له پێناوی چ ئاوات و ئامانجێکدا چه‌کت هه‌ڵگرت و بوویت به پێشمه‌رگه‌ی کۆمه‌ڵه؟**

من له سه‌ره‌تادا له پێناوی هێنانه سه‌رکاری حکومه‌تێکی کرێکاری و روخانی رژیمی ئیسلامی خه‌باتم ده‌کرد. پیم وابوو ده‌کرێ کوردستان گۆمی خوین بیت و سه‌نگه‌ری ئازادی و دیموکراسی بێت. ده‌کرێ به شه‌ری چه‌کدارانه‌ی پێشمه‌رگه‌ی کورد، به نه‌داری و هه‌ژاری کوردستانی به‌خسیره‌وه، ده‌توانرێت حکومه‌تی کرێکاری له ئێراندا دامه‌زرێنرێت. پیم وابوو پشتیوانی بیسنووری ناوچه‌کانی تری ئێران وه‌ک لێشاوو لافاو به‌ره‌و کوردستان دیت. ده‌کرێ خوین بده‌ین و قوربانی گیانی و ماڵی بده‌ین تاکو له به‌رامبه‌ر رژیمی کۆنه‌په‌رست دا بوه‌ستین و هه‌موو ئێران رزگاربکه‌ین. که‌چی له کرده‌وه‌دا هه‌ر کوردستان گۆمی خوین بوو، هه‌ر کوردستان قه‌لاچۆ و بۆردومان ده‌کرا و تاقه سه‌نگه‌ری ئازادی هه‌ر کوردستان بوو. به‌هۆی نه‌بوونی سته‌می میللی و په‌یوه‌ندی هاوبه‌شی مه‌زهه‌بیی و فه‌رهه‌نگیی له ناوچه‌کانی دیکه‌ی ئێران رژیمی ئیسلامی توانی ره‌گوریشه‌ی خۆی داکوتیت و خۆی بچه‌سپێنیت. له‌به‌رئه‌وه توانی هه‌موو هێزی سه‌رکوتکه‌ری خۆی به‌ره‌و کوردستان رێکبخات و جه‌نایه‌ت و کوشتاری خه‌ڵکی کوردی پێبکات. له باری عه‌مه‌لییه‌وه کوردستان به تاقی ته‌نها مایه‌وه، ته‌نها یارمه‌تی ده‌ریک که هه‌یبوو خه‌ڵکی کورد خۆیان بوون.

**پ2 : باوه‌ڕی تۆ چییه له‌سه‌ر چوونی کۆمه‌ڵه بۆناو حیزبی کۆمۆنیستی ئێران؟**

کۆمه‌ڵه نه‌چووه ناو حیزبی کۆمۆنیستی ئێرانییه‌وه به‌ڵکو کۆمه‌ڵه خۆی هێزی سه‌ره‌کی و پێکهێنه‌ری حیزبی کۆمۆنیستی ئێرانی بوو. کۆمه‌ڵه له‌گه‌ڵ گروپی سه‌هه‌ند "ئیتیحادی خه‌باتگێرانی کۆمۆنیست" پرۆگرامی تایبه‌تییان په‌سه‌ندکرد و حیزبی کۆمۆنیستی ئێرانییان دروست کرد. دیاره کۆمه‌ڵه له‌و سه‌رده‌مه‌دا خۆی ئه‌وه‌نده هێزو توانای هه‌بوو که راسته‌وخۆ و بێ یارمه‌تی گروپێکی بچکۆله‌ی غه‌یری کورد ئه‌و حیزبه رێک بخاو سازمانده‌ییان بدات. کۆمه‌ڵه به‌وپه‌ڕی خۆشباوه‌ڕی و متمانه‌وه ده‌ستی ئه‌م گروپه‌ی گرت و یارمه‌تیدان. وه‌ک نه‌زه‌ر و بیرو باوه‌ڕی شه‌خسی پیم وایه کۆمه‌ڵه کاتێک به‌رنامه‌ی هاوبه‌شی په‌سه‌ندکرد، له‌و کاره مێژووییه‌دا قازانجی نه‌کرد. ئه‌ڵبه‌ته له‌و هه‌ڵه مێژووییه‌دا به‌شی هه‌موو که‌سێکی به‌شداری تێدایه، یه‌کێکیان خۆمم که بۆ دروستکردنی حیزبی کۆمۆنیست ده‌نگم داوه و پیم وابوو دروست بوونی حیزبی کۆمۆنیستی ئێران ده‌سکه‌وتێکی مێژووییه.

**پ 3: ڕای تۆ چییه له‌سه‌ر ئه‌و گروپه فارسه‌ی که ڕابه‌رایه‌تی بزووتنه‌وه‌که‌یان خسته ژێرده‌ستی خۆیانه‌وه ؟**

ئه‌وان شمشێر و قه‌ڵه‌میان له تاریکی ده‌کێشاو هه‌رگیز توانای رێبه‌ری بزوتنه‌وه‌یان نه‌بوو. کۆمه‌ڵه‌یان وه‌ک ئامرازێک بۆ گه‌یشتن به ئامانجه‌کانی خۆیان، که تێکدانی شۆرش بوو که‌ڵک وه‌رگرت. گروپی ئیتیحادی خه‌باتگێرانی کۆمۆنیست که هه‌موو ژیانیان له ئه‌مریکا و ئه‌وروپا به‌سه‌ر بردبوو، پاش شۆرشی ئێران گه‌ڕانه‌وه. ئه‌م گروپه له که‌سانی زۆرزان پێکهاتبوون و کارامه‌بوون له نوسین و تیۆری دارشتندا. ئه‌م گروپه له سه‌داقه‌ت و دڵپاکی و توانایی رێکخراوی کۆمه‌ڵه سوودیان وه‌رگرت. قه‌ڵای کۆمه‌ڵه‌یان له ناوه‌وه داگیرکرد. ئه‌م که‌سانه هه‌موو جارێک نووسه‌رانی رێکخراوه‌که‌یان به‌وه تاوانبار ده‌کرد بۆچی ئیمزای خۆتان راسته‌وخۆ نانوسن، تاکو چینی کرێکاری ئێران رابه‌رانی داهاتووی خۆیان بناسن. ده‌یانگوت ئه‌مه خیانه‌تێکی گه‌وره‌یه ئه‌گه‌ر چینی کرێکار رابه‌رانی خۆی نه‌ناسێ. که‌چی له کرده‌وه‌دا خۆیان که ده‌یان نووسی هه‌موویان ئیمزای جه‌علی و ناوی نه‌هێنییان به‌کار ده‌هێنا. هه‌ریه‌که‌یان دوو تا سێ ناویان بۆخۆیان هه‌ڵبژاردبوو. به‌م جۆره مێشکی سه‌ری خه‌ڵکه‌که‌یان بردبوو وه به ئه‌ندامانیان قه‌بوڵ کردبو که گیروگرفتی خه‌ڵکی ئێران و کوردستانیش ته‌نها له تیۆری پوچ و وشکی سیاسی ئه‌وانه‌وه نه‌بێ حه‌لناکرێ و هیچ رێگایه‌کی دیکه نییه. ئه‌وان به‌رده‌وام هێرشیان ده‌برده سه‌ر رێکخراوه‌کانی کۆمه‌ڵه و کۆمه‌ڵه‌یان به‌خزمه‌ت کردنی بۆرژوازی تاوانبار ده‌کرد، به‌م تاوانانه کۆمه‌ڵه‌یان له خه‌ڵک و خه‌ڵکیشیان له کۆمه‌ڵه دوور خسته‌وه. له‌م بواره‌دا کۆمه‌ڵه زه‌ره‌ری زۆری کرد. خه‌ڵکی کورد ئه‌مانه ناناسێ و متمانه‌شیان پێناکات. به لای منه‌وه ته‌نیا شۆرشگێرانی کورد که دڵسۆزی راسته‌قینه‌ی چینی کرێکار و زه‌حمه‌ت کێشی کوردن ده‌توانن رابه‌رایه‌تی میلله‌تی کورد بکه‌ن.

## پ4 : دەتەوێت چی بلێیت لەسەر ئەو کەسانەی کە لە ناو کۆمەڵەدا هاندەری پێکهێنانی حیزبی کۆمۆنیست بوون؟ کێ لێپرسراوە بەرامبەر بەو ڕووداوانە کە بەسەر کۆمەڵەدا هات؟

ئەو کەسانەی کە کۆمەڵەیان بەرەو دروستکردنی حیزب هاندەدا و پروپاگەندەیان بۆدەکرد، پێیان وانەبوو ڕۆژێک لە ڕۆژان توشیان دەبێت بە تووشی سیمایەکی درۆزنی ئیتیحادی خەباتگێرانی کۆمۆنیستەوە، کە لە هەوەڵدا خۆیان لەژێربالی کۆمەڵەدا حەشاردابوو وە گاڵتەیان بە شۆڕشی کورد دەکرد. ئیتیحادی خەباتگێرانی کۆمۆنیست هاتن لەسەر سفرەی حازری شۆڕش دانیشتن و جێگایان بە هەموو تەنگ کرد. لەم ناوەندەدا کۆمەڵە توشی هەڵەیەکی مەزن هات و نەدەبوایە ئەوەندە لیبوردووبن بەرامبەر ئەوان. ئەندامانی ناوەندی کۆمەڵە زۆرجێگای باوەڕ و متمانەبوون کە گومانیان لێناکرێت. شەخسییەتی سیاسی و رابەر بوون شتێکەو هەڵەی سیاسی مێژووی و خۆشباوەڕیی شتێکی دیکەیە. بە ڕای من، ئەندامانی ناوەندیی کۆمەڵە زۆر لە ڕادە بەدەر قەدریان لە کەسانی ئیتیحادی خەباتگێرانی کۆمۆنیست گرت و خۆیان بەکەمتر دەزانی لەبەر دەمیاندا. بێگومان هەموو دەزانین ئەوان شیاوی ئەو هەموو ڕێزو ئیحترامە نەبوون.

## پ 5 : ئایا تۆ کۆمەڵە بە ڕێکخراوێکی کوردستانی دادەنێیت یاخود بە ڕێکخراوێکی ئێرانی؟

کۆمەڵە لە پێناوی ئامانجەکانی زەحمەتکێشی خەڵکی کورد دا دروست بوو. سەد لە سەدی ڕێکخستن و کادیر و ئەندامان و پێشمەرگەی کۆمەڵە لە نەتەوەی ژێردەستی کورد پێکهاتوون. پاش هەژدە نۆزدە ساڵ لە تێپەڕبوونی شۆڕشی ئێران، کۆمەڵە جگە لە خەڵکی کورد، لە لایەن نەتەوەکانی تری ئێرانەوە یارمەتی نەدراوە. دەیان بەڵگەو فاکتوری تر ئەمە دەسەلمێنن. لە ڕوانگەی مێژووییەوە، بە قازانجی کۆمەڵەیە کە بۆ خەڵکی کورد تێبکۆشێت و خەبات بکات. بێگومان کۆمەڵە بەبێ نەتەوەی کورد توانای نییە و هەرەس دێنێ و توشی شکست دەبێ. ئاکرێ کۆمەڵە بەرامبەر مێژوو و نەتەوەی کورد وەڵامێکی نەبێ!

## پ 6: هەڵوێستت لەسەر حیزبی کۆمۆنیستی ئێرانی چییە؟

من بۆ چونم بەرامبەر حیزبی کۆمۆنیست گۆڕدراوە. لە هەرباریکەوە هەڵیسەنگێنیت حیزبی کۆمۆنیستی ئێرانی بەهەموو شێوەیەک بۆ جەماوەری خەڵکی کوردستان نامۆ و بێگانەیە. دیارە بە درێژایی مێژوو ئەمانە بۆردومانی سەنگین و بێ‌ڕەزای مێشکی ڕوناکبیری کوردیان کردووە. ئێستاش ئەگەر ڕەفزی حیزبی کۆمۆنیستی ئێرانی بەمەرناویکەوە بکەیت بە خیانەت لەقەڵەم دەدرێ. ئەگەر بڵێیت کوردستان موستەعمەرەیەکی هاوبەشی داگیرکەرانە ئەوا بە خێرایی لە لایەن ئەمانەوە بە وەڵامی ناسیۆنالیست و دژایەتی لەگەڵ چینی کرێکار و خیانەت بە ئامانج و پرۆگرامی مارکسیزم- لینینیزم لەقەڵەم دەدرێت و هەزاران ناو و ناتۆرەی نارەوات لێدەنێن. ژەهری شۆڤێنیزم ماوەیەکی درێژە بەسەرماندا ڕژاوە. باشترین کار بۆئەوەی کۆمۆنیستێکی غەیری کورد هەڵسەنگێنیت ئەوەیە لێی بپرسیت ئایا جەنابت سەبارەت بە مەسەلەی کورد چی دەڵێیت؟ هەموویان پێ لەسەر مەسەلەی کورد دادەگرن بەڵام بەو مەرجەی کوردستان هەر موستەعمەرەی هاوبەشی ئەوان بێت، داوای مافی جیابوونەوە نەکات و ئەو سنوورانە هەر لەشوێنی خۆیدا بهێڵێتەوە و ئاڵاکانیان وەک جاری جاران لەسەر خاکی نەتەوەی کورد هەر بشەکێتەوە. "وەتەنی عەرەبی" و "ئێران زەمین" و "ئەتاتورکستان" دەستکاری نەکرێ و ئێمەش کە بەرژەوەندیمان جیاوازە و زمان و فەرهەنگو کولتوریکی جیاوازمان هەیە هەر بەکۆیلەیی لەژێردەستی ئەواندا بمێنینەوە. تف لەو ناچارییەی کەسەری کورد دەکات بە ماڵی دوژمندا. بڕوام وایە پێکهێنانی حیزبێکی کۆمۆنیستی کوردستان لەبارترو گونجاوترە و دەتوانێت هێزێکی زۆر لە دەوری خۆی کۆبکاتەوە. ئەمڕۆ گەورەترین نەتەوەی بێدەوڵەت و بێدەستەڵات کوردەکانن. نزیکەی 25 ملیۆن کورد، بگرە زیاتریش، لە مافی سەرەتایی بێبەشن. ئەگەر دوژمنان و داگیرکەران دەڵێن " کوشتنی سەگ و کورد هیچ جیاوازییەکی نییە " کاتی ئەوە هاتووە داچڵەکێین و بەردێک لەسەر بەردێک بۆخۆمان بنێین ئەگینا مێژوو نامان بەخشێت.

## پ7 : ئایا چارەسەرکردنی کێشەی کورد لەڕێگای هاتنە سەر حوکمی چینی کرێکاری ئێرانییەوە دەکرێت؟

نمونەی چاکمان هەیە: سۆڤیەت و یۆگسلاڤیا دوو وڵاتی فرە نەتەوەی کۆمۆنیست بوون. خۆ چینی کرێکار لەم دوو وڵاتەدا دەستەڵات و هێزی سیاسی و ئابووری دەوڵەتەکەیان بە دەستەوە بوو. بەڵام لە سۆڤیەت تەنها ڕوسەکان و لە یۆگسلاڤیاش تەنها سەربەکان خاوەنی دەستەڵات بوون و مافیان هەبوو. ئایا حکومەتی چینی کرێکار لە ئێران دەستەڵات بگرێتە دەست لە چینی کرێکاری ئەم دوو وڵاتە باشتر دەبن؟ دەبێت ئێمە دیسانەوە خۆشباوەڕ و سادەبین و قەناعەت بەوە بکەین ئەوان مافی چارەنوس و جیابونەوە قەبوڵ دەکەن؟ ئایا ئەوان دەمێڵن پەرلەمانمان هەبێت و هێزی داگیرکەریان لە کوردستان دەبەنەدەرەوە و پادگانەکان خاڵی دەکەن و دەیکەن بە کتێبخانە و مەیدانی وەرزشی و زانستگا. مەگەر ئەمە خەیاڵێکی خاو نییە؟! مەگەر بەرنامەی حیزبی کۆمۆنیستی کرێکاری ئێران وەزع و چارەسەرکردنی مەسەلەی کوردی لە ئێراندا نەخستۆتە چەند قۆناغ و پرۆسێسێکی دوور درێژەوە، زمانی فارسیان نەکردۆتە زمانی ڕەسمی و جیابونەوەی کوردستانیان بە زەرەری چینی کرێکاری نەتەوەی کورد هەڵنەسەنگاندووە؟ شۆڤێنیزم و بیروڕای پان ئێرانیزمی ئەمانە

ئەوەندە بەربڵاو و بەهێزە کە بەردەوام بۆ کوتان و بێ ئابڕوو کردنی نوسراوەو بیری ئازادی کورد بەکاری دەهێنن. بۆ نمونە ئەگەر کوردێک بڵێت من ئارەزوو دەکەم وەک تۆ خاوەنی دەوڵەتی خۆم، ئاڵای خۆم، پێناس و پاسی خۆم بم، ئەوا لەلایەن ئەمانە و فەرهەنگی داسەپاوەوە تەحقیر دەکرێت و گاڵتە و سوکایەتی پێدەکرێت. هەموو ئەم ڕوناکبیرانەیان بە بەهانسای وەک کوردایەتی کردن، هەستی ناسیۆنالیستی و ڕێز دانەنان بۆچینی کرێکار و کۆمۆنیزم تاوانبار دەکەن. بەم جۆرە چەکەکانین لیدەستێنن و پاسیڤیان دەکەن و وورەیان پێ بەر دەدەن. ئەو وڵاتانە کوان کە دیفاع لە بەرابەری بێ قەیدو شەرتی نەتەوەکان دەکەن؟ ئەو وڵات و نەتەوانەی وا هاوسێی کوردستانن دوژمنی ڕاستەوخۆی نەتەوەی کوردن و داگیرکەری کوردستانن. سیستیمی دەوڵەتی داگیرکەران وەک کورەی توانەوە وایە. ئەمانە دەیانەوێت کورد لە بۆتەی فارس عەرەب و تورک دا بتوێننەوە. کام ڕوناکبیر، کام مرۆڤی شەریف و ئازادیخواز ئەم ڕاستییە ناسەلمێنێت و قەبوڵی ناکات؟!! ئێمەی کورد بە درێژایی سێ سەد ساڵ سیستیماتیسک مێشکمان بۆردومان کراوە. باوەڕ و متمانەمان بە خۆمان نەماوە مێشکمانیان کۆت و زنجیر کردووە. ئەو بۆردومانە فەرهەنگییە وەکو ژەهرێک وایە کە بە درێژایی ئەم مێژووە لە لەشمان دراوە و گێژو کاسی کردوین بە جۆرێک کە ڕوناکبیرەکەشی دڵی بۆ نەتەوەکەی، کە کوردە، داناچڵەکێت و خەبات و تێکۆشانەکەی لە خزمەتی کوردی هەژاردا نییە. ژمارەی ئەو "ڕوناکبیرە کوردانە" کەم نین کە حاشا لە کورد بونی خۆیان دەکەن. فەرانس فانوون دەڵێت: "کاتێک مرۆڤێک هەوەڵین گوللەی دژی دوژمن و داگیرکەرەکەی تەقاند. لە ڕاستیدا بەرەو سنگی خۆی تەقاندویەتی و خۆی دەکوژێ. پاشان و دیسانەوە ئەو مرۆڤە لە دایک دەبێت". ئەم ووتەیە بۆ کورد ڕاستە. دەبێت ئەو نەتەوەیە باوەڕ و متمانەی پێویست بەدەست بهێنێت و دژایەتی ڕاستەو خۆی لەگەڵ ئەو تەحقیرو سوکایەتییەی، کە فەرهەنگی داگیرکەر بەسەریدا سەپاندووە، بە توندی بکات. گیانەکەم تۆ وەکو مارکسیست- لینینیست ئەو مافەی من پێشێل مەکەو تۆمەتی ئارەوام لێمەدە. مەگەر و ئایا مارکسیزم -لینینیزم ئێستا ئەڵترناتیڤە بۆچارەسەرکردنی مەسەلەی نەتەوەی کورد؟! لە کام بواری مێژوودا پێشمەرگەی کورد لە ناوچەیەکی تر و غەیری کوردستان شەڕی کردووە؟ هەموو کاتێک لە هەموو بوارەکانی مێژوودا پێشمەرگە و خەڵکی کورد لە سەر خاکی خۆیان بەرگرییان لە خۆیان کردووە و خاکی نەتەوەیەکی دیکەیان داگیر نەکردووە. بەڵکو ئەوان هاتونەتە سەرمان و ماڵ و وڵاتیان لێ داگیرکردوین. ئەوە ئەوانن وڵاتی ئێمەیان بە سەرباز و سوپاوە گەمارۆداوە و بەردەرگایان بە ئێمە گرتووە و شەڕمان لەسەر ماڵی خۆمان پێدەفرۆشن. مەگەر کوردستان ویرانە نییە؟! دیارە لە کردەوەدا "ئەوەی بەتەمای کاسەی دراوسێ بێت بێ شێو سەردەنێتەوە".

(ئەم چاوپێکەوتنە لە 8 .02 . 1998 دا کراوە)

بنەماڵەی مستەفا سوڵتانی پێنج براو دوو ئامۆزایان بە دەستی ڕژیمی ئێرانی شەهید کراوە. مامۆستا ڕەشاد کوڕی شەشەمی ئەم بنەماڵەیەیە. ساڵی 1948 لە مەریوان لە دایک بووە، خوێندنی سەرەتایی لە شاری سنە و ڕشتەی جوگرافیای سروشتی لە تاران تەواو کردووە و پاشان بووە بە مامۆستای ئامادەیی (دەبیرستان). لە ساڵانی (1972 و 1973) دا بەهۆی کاری سیاسییەوە دوورخراوەتەوە بۆ شاری نەهاوەند، پاشان گەڕاوەتەوە بۆ شاری سنە. لە سەرەتای شۆڕشی ئێراندا چالاکانە بەشداری کردوە لە دروستکردنی جەمعییەتەکان و هاندان و ڕێکخستنی قوتابیان . لە ساڵی 1979 تا ساڵی 1987 پێشمەرگەی کۆمەڵەی زەحمەتکێشان بووە و لە ڕۆژنامەی پێشڕەو و ڕادیۆی کۆمەڵەدا کاری کردووە.

میللەتی کورد بیەوێت یان نەیەوێت، لە لایەن وڵاتانی دیکەوە، ئەم ڕێکخراوە کوردییانە بە نوێنەری کورد لە قەڵەم دەدرێن. هەتا ئەم ڕێکخراوانە نوێنەری بن، مەسەلەی کورد نە لە لایەن دوژمنانییەوە حسابێکی سیاسی بۆ دەکرێت، نە دۆستەکانیشی دەتوانن بە چاوێکی جدییەوە هەڵی بسەنگێنن.

سەرەڕای ئەو هەموو زەبرو زەنگەی داگیرکەرانی کوردستان بەکاریان دەهێنا، هیچ کاتێک نەیان توانیبوو ورەی میللەتی کورد بڕوخێنن. ئەو میللەتەی ئەنفال کراو چەکی کیمیاوی پێ تاقی کرایەوە، ورەی نەڕوخا، بەڵکو بە ڕاپەڕینێکی جەماوەریی لەشکری دڕندەترین دوژمنی لەشارەکانی کوردستان وەدەرنا و هیوایەکی مێژوویی بەدی هێنا. بەلام ئەو ڕێکخراوە کوردیانەی لە هەڵبژاردنی(19.05.1992)ی پەرلەمانەکەدا، متمانەی ئەو هەلە مێژووییەیان پێ سپێردرا، نەک هەلە مێژووییەکەیان لە ماوەیەکی کەمدا بە تەمامی لەڕەگەوە دەرکێشا، بەڵکو کارێکی واشیان کرد کە کورد باوەڕی بەوە نەمێنێت، ڕۆژێک لە ڕۆژان بتوانێت حوکمی خۆی بکات.

ئەمڕۆ میللەتی کورد هیچ کۆنتراکتێکی لەگەڵ ئەو ڕێکخراوە کوردیانەی باشووری کوردستان نییە، بۆیە ناتوانێت هیچ مەرجێکیان لەسەر دابنێت. تەنیا ڕێگا دەست بەردانە لەم ڕێکخراوانەو خۆڕێکخستنەوەیە لە کۆنتراکتێکدا.

# دایکی فوئاد وەسیەت دەکات کە جلوبەرگی کوڕە شەهیدەکانی لە کفنەکەیەوە بپێچن و لەگەڵ تەرمەکەیدا بینێژن



## ئەو تاکە ئاواتەی پاش مردنی بۆ ی هاتە دی.

لە بنەماڵەی مستەفای سوڵتانی ( 5 ) براو دوو ئامۆزایان شەهید کراون. کاک فوئاد سوڵتانی ئەندامی ناوەندی و یەکێک لە دامەزرێنەرانی کۆمەڵە بوو. لە ساڵی 1948 لە ئاوایی هەڵمانەی سەریە مەریوان لە دایک بووە. لە سنە خوێندنی ناوەندی تەواو کردووە و لە تاران ڕشتەی موهەندیسی کارەبا ( بەرق )ی خوێندووە، بۆکارکردن وەکو موهەندیسیک دەگەڕێتەوە شاری سنە. بە هۆی جموجوڵی سیاسییەوە دەزگای ساواک دەیگرێت و ماوەی چوارساڵ زیندانی دەکرێت. لە زیندان لەسەر کارکردنی سیاسی بەردەوام دەبێت، سەرپەرشتی مانگرتنێکی گشتی لەناو زیندانییەکاندا دەکات. بەر لە ڕوخانی ڕژێمی شا، کاک فوئاد ئازاد دەکرێت، بەڵام تەنها یازدە مانگ دوای ئازاد بوونی دەژی. لە سەرەتادا یەکێتی جوتیاران ڕێکدەخات و بەخێرایی گەشەی پێدەدات. چالاکانە بەشداری دەکات لە پێکهێنانی جەمعیەتە جەماوەرییەکان کە بەناوی جیاوازەوە لە شارەکاندا ڕێکدەخران. سەرپەرشتی ڕێپیوانی خەڵکی سنە بۆ مەریوان دەکات و ڕێکی دەخات. یەکێک لە ئامانجەکانی کاک فوئاد مافی چارەنوس تاڕادەی جیابوونەوە دەبێت بۆ خەڵکی کورد. لە هاوینی ساڵی 1979 لەسەر ڕێگای مەریوان/ بانە دەکەوێتە شەڕەوە و بەدەستی جمهوری ئیسلامی شەهید دەکرێت.

کاک حسێن و کاک ئەمین لە سەربازگای ( پادگان )ی مەریوان لەگەڵ چەند پێشمەرگەیەکی دیکەدا لە ساڵی 1979 گوللەباران دەکرێن. کاک ماجید و کاک ئەمجەد کە لە تەبریز خەریکی هەڵسوڕانی کاری نهێنی دەبن بۆ کۆمەڵە، لە ساڵی 1982 دا دەستگیر دەکرێن و گوللەباران دەکرێن. دوو ئامۆزاکەیان، ( کاک ناسر لە گوندی دزلی ) و ( کاک ئەحمەد لە گوندی مەجمنە ) شەهید دەکرێن.



The Mostafa Soltani brothers. *From left to right:* Hossein, Amjad, Foad, Majed, and Amin
(لە لای چەپەوە بۆ ڕاست: حوسێن، ئەمجەد، فوئاد، ماجید و ئەمین)

### ڕەشاد سوڵتانی دەڵێت :

باوکم دەربەدەری دەستی ڕژێمی ئێران بوو زوو ئەویی بەجێهێشت و لە سولیمانی مایەوە. پاشان بەرەو سوئێد هات و بووبە پەنابەر. پاشماوەیەک بریاری گەڕانەوەی کوردستانیدا و لەوێ کۆچی دوایی کرد. دایکی شەهیدەکان لە نەخۆشخانەی ئوپسالا کۆچی دوایی کرد. تەرمەکەی دایکمان بەرەو کوردستان ناردەوە. بەپێی وەسیەتی خۆی جلوبەرگی کوڕە شەهیدەکانی، کەلە کاتی تیرباراندا کون کون کرابوون، لە کفنەکەی پێچرا و پاشان تەرمەکەی نێژرا. تەنها ئەو ئاواتەی پاش مردنی بەجێهات. لەوکاتەدا کە ئێمە لەو هەموو شین و ناخۆشییەدابووین تاقەکەسێکی غەیری کورد، کە خۆیان بە کۆمۆنیست و هاویاوەڕی ئێمەدەزانی، هاودەردی غەم و بەشداریان لە شینی ئێمەدا نەکرد و بە دەنگمانەوە نەهاتن.

# شکستی نەسلی خودموختاری!

**• کەللەی ئەو کوردانەی قەلاکەیان پاراست بوو بەزیندوویی بگوران**

**• سەربەخۆیی و ژێردەستی وڵاتی داگیرکراو، نەبەستراوە بە دیموکراتی ودیکتاتۆری وڵاتی داگیرکەرەوە**

سەروەر

نەتەوەیەک بە هیوای سەربەخۆیی، بە دڵ پاڵپشت بێت و دریغی نەکات لە قوربانیدان بۆ هەر ڕێکخراوێک، مافی لێپرسینەوەی بەرامبەر بەو ڕێکخراوە هەیە. خەڵکی کورد دەبێت لە ئەنجامی سیاسیی ئەو بزوتنەوەیە کە حیزبی دیموکرات خۆی بە نوێنەری دەزانێت پرسیار بکات: ئایا ئامانج و خواستی سیاسی حیزبی دیموکرات هەمان ئامانج و خواستە کە نەتەوەی کورد دەیەوێت؟ بۆچی بزوتنەوەکە لەسەر ڕێگای سەربەخۆیی دروست دەبێت بەڵام ڕێبازەکەی بە خودموختاری دەگۆڕدرێت؟

## 1 ــ ئێران وڵاتێکی بەزۆر دروست کراوە

سەفەوی بزوتنەوەیەکی سیاسی و دینی بوو لە باکوری ئێراندا دەستی پێکرد. لە ساڵی(907ی ک./ 1501ی ز.) دا شا ئیسماعیلی سەفەوی شاری تەبریز دەگرێت و دەیکاتە پایتەختی سیاسی و دینی خۆی ( 1 ). ئامانجی شا ئیسماعیل دروستکردنی دەوڵەتێکی مەرکەزیی بەهێز بوو. لەگەڵ دروست بوونی ئەو دەوڵەتە نەتەوەییانەی کە لە ئەوروپای ڕۆژئاوا دەستی بەسەرهەڵدان کرد هاوکات بوو. پێکهاتی ئەم دەوڵەتە نوێیانە سیستێمێکی دەسەڵاتداریتی نوێیان هێنایە کایەوە، کە لە شێوەی بەڕێوەبردندا لە دەسەڵاتداریتی نامەرکەزی دەوڵەتەکانی پێشوو جیاواز بوو. بەڵام دەوڵەتەکەی شا ئیسماعیل زیاتر لەسەر بناغەیەکی دینی دروستکرا. شا ئیسماعیل لە پێناوی دروستکردنی دەوڵەتێکی یەکگرتوو، حکومەتێکی مەرکەزی بەهێز و پەیداکردنی ناسنامەیەکی نەتەوەیی و دینی یەکگرتوودا دەستی بە جێبەجێکردنی چەند کارێک کرد ( 2 ):

1-دەوڵەت دەبوو یەک مەزهەبی دینی یەکگرتووی هەبێت، شیعە کرایە مەزهەبی ڕەسمی و بەزۆر سەپێندرا.

2-یەکخستنی خاکی ئێران بە زۆر و کۆکردنەوەی لە ژێر ئاڵای حکومەتی مەرکەزیدا.

3-دەوڵەت دەبوو داب و نەریت و فەرهەنگێکی یەکگرتووی هەبێت بۆ ئەوەی خەڵکی لە هەموو شوێنێکی ئێراندا لیی تێ بگەن.

4-لە لایەن دەوڵەتی مەرکەزییەوە لێپرسراوە ئیداری و سەربازییەکان دادەنران، نەک لە لایەن خەڵکی ناوچەکان خۆیانەوە.

5- لە بەر ئەوەی دەوڵەتی ئێران خاکی چەند نەتەوەیەکی بە زەبری شەڕ خستبووە سەر سنورەکەی، شا دەیویست لەم وڵاتە فرە نەتەوەییەدا دەوڵەتێکی نەتەوەیی ئێرانی دروست بکات. بۆ ئەم مەبەستە پێویست بوو دیمۆگرافی خەڵکی ناوچەکە بگۆڕێت و کورد بە زۆر بۆ ناوچەکانی دیکەی ئێران ڕاگوێزێت و لەسەر خاکی ئەمان ئازەری نیشتەجێ بکات.

شا ئیسماعیل سنووری وڵاتەکەی فراوان دەکرد، ڕۆژهەڵاتی کوردستان بە کوشتارێکی زۆر داگیر کرد و خستییە ژێر دەسەڵاتی دەوڵەتی ئێرانەوە. شاکانی ئێران بە بێ جیاوازی، یەک بە دوای یەکدا، لە پێناوی پاراستنی یەکێتی سنور و خاکی ئێراندا، سیاسەتی دڕندانەیی خۆیان لە جێگیرکردنی دەسەڵاتی ئێران لە کوردستاندا زیاد دەکرد.

## 2 ــ کێ شانازی بە ئێرانی بوونی خۆیەوە دەکات؟

دەوڵەتی ئێران بەزۆر دروست دەکرێت و کوردستانیش بەزۆر دەخرێتە سەری. لەم مێژووە بەزۆر دروستکراوەدا دوژمن نەتەوەی کورد بۆ زیندانی ئێران دەبات و حیزبی دیموکراتیش داوای مانەوەی زیندانەکەی بۆ دەکات. قەتلوعامی کورد لە سەرەتای دروستبوونی دەوڵەتی ئێرانەوە دەست پێ دەکات. پاش گرتنی تەبریز هێرش بۆ داگیرکردنی کوردستان دەکرێت. ئەمانە چەند نمونەیەکی قەتلوعامی ئێرانن کە دژ بە نەتەوەی کورد کراون:

لە ساڵی 912 ی ک. شا ئیسماعیل کوشتاری کوردەکانی ناوچەی "خوی" دەکات و ژمارەیەکی زۆریشیان بۆ خۆراسان ڕادەگوێزێت ( 3 ).

شا تهماسب لە گرتنی قەڵای ئەرجیش لە ساڵی 960 ی ک. دا فەرمان

دەدات "کەللە سەری ئەو کوردانەی قەڵاکەیان پاراست بوو بە زیندویتی بگوورن" (4). شا عەباس لەساڵی 1011 ی ک. دا (50 هەزار) خێزانی کورد بۆ خۆراسان دەگوێزێتەوە. لەساڵی 1019 ی ک. دا دەست دەکات بە گەلکوژی ناوچەی موکریان. نووسەرێکی سەردەمی شا عەباس دەربارەی کوشتاری موکری نووسیویەتی:

(شا عباس فەرمانی دا بەسەربازەکانی خۆی بۆ ئەوەی بکەونە کوشتنی ئێلی موکری لەو ناوچەیەدا کە تیا دەژیان و دوانزە فرسەنگ بوو. بۆ ئەمەش 60 هەزار سوارە، لە ماوەی 4 شەو و 4 رۆژ دا خەریکی قەتلوعام بوون) (5). مەلا جەلالی منجم نوسەری هاودەمی شا عباس، چەند نمونەیەک لە رووداوەکان بەم مجورە ئەگێرێتەوە: "یەکی لە غولامەکان، لە ناو دیلەکاندا منالیکی 8 سالەی بو، منالەکە کابرایەکی بە شمشێرەکەی خۆی لە چەند لاوە بریندار کردو بە زمانی کوردی وتی " ئەوە لە باتی خوینی باوانم" دەستبەجی منالەکەیان کوشت". " هەروەها ژنیکی ئاوس لەگەل چکولەیەکی 6 سالەدا، پیاوێ بەتوندی قسەی ئاشرینی لەگەل کرد بو، ژنەکە سەری چکولەکەی خوی بریوە و کیردیکی

کردوە بە زگی خوی دا و ئەو مندالەشی کوشت بو کە لە زگی دابو، ئەیویست خوشی بکوژی، ئەوانیش دەستیان ئەگرت و وتی: " دوای میردەکەم منیش ژیانم ناوی " سەری خوی بری" (6). جاریکی دی لە گرتنەوەی قەلای دمدم دا نووسەریکی ئەفشار بەشیکی رووداوەکە بەم شیوەیە دەگیریتەوە و دەلێت: "شتی سەیر ئەوە بوو 86 کچۆڵەو تازەبوکی ئەشرار لە ترسی ئەتک کردنی پەردەی ناموسی خۆیان، کە ئەوەکو دەستدرێژییان بکرێتە سەر شەو لە بەرزایی بورجەکانی سەر دیواری بلندی قەڵاوە خۆیان هاویشتبوە ناو دۆڵیکی قوڵەوە، گیانیان سپاردبوو" (7). لە ساڵی 1216 ی کۆچی دا هێرشی دەوڵەتی ئێران بۆ سەر ئێلی بلباس بوو بە هۆی نەمانی ئەم ئێلە کوردە. (لە ئەنجامی شەرەکەدا ئێلی بلباس تێک شکاو شپرزە بوو. ژمارەیەکی ئەوەندە زۆریان لیکوژرا، بەقسەی میرزا رەشید، بە فەرمانی بەگلەربەگ لە بناری چیای قەندیل دا " لە سەری براوی پیاوەکانی ئەم ئێلە لە دوو جێگە منارەیان دروست کرد، موئەزین بۆ بانگدان لەسەریان راوەستان". پێنج شەش ئەسپی رەسەنی ئەو تالانییەشیان هەڵبژارد لە سەللکی شەرکەرانی کورد باریان کردن و، بە رەشید سلتان قاسملوی ئەفشاردا، بە دیاری بۆ فتحعلی شایان نارد. ماڵ و دارایی و ران و رەوەی ئەم ئێلە تێکشکاوە و هەرچی بەردەستی دوژمن کەوت بە تالان برا(8).

ئەمانە و دەیان نموونەی تر شایەتی ئاشکرای قانونین کە دەوڵەتی ئێران بە کوشتاری زۆر نەک بە خواستی خەڵکی کورد، کوردستانی داگیرکردووە. لەگەڵ ئەمانەشدا سادقی شەرەفکەندی سکرتێری گشتی پێشوی حیزب، کە بەدەستی ئێران تیرۆر کرا، لە گوتوبێژێک دا دەڵێت: "لە راستیدا کوردەکان ئێرانین وەیانی نیکەلاوی قووڵی فەرهەنگی و کۆمەڵایەتییان لەگەڵ ئێرانیەکان هەیە. کوردەکان پێکهێنەری ئێران بوون، وە لە پارێزگاری ئەودا بەشداربوون. فەرهەنگی کورد فەرهەنگی ئێرانیە. بەو پێیە کێشەی دابڕینی خاک وە ئەو قسانەی بۆ کوردەکانی کە لە تورکیا یان بۆ عەرەبان دروست بێ چونکە لەگەڵ تورک و عەرەب هەرچەشنە یەکێتیەکی مێژوویی، دەستکردە وە رواڵەتە. بەلام هیچ کەس وەک کوردەکان خۆی بە ئێرانی دانانێ (وە ئەمە تەنیا لە بەینی کوردی ئێران نیە، بەڵکە لە ناو کوردی تورکیاو عێراقیشدا بەدی دەکرێ)..." (9).

کوشتاری خەڵکی کورد لە کاتی رژێمی ئیسلامیدا بەرفراوانتر بوو. خومەینی فتوای دا کورد کافرە و بریاری قەتلوعامی دا. حیزبی تودە، ئەکسەرییەت و هەندێک لەچەپو مارکسیە ئێرانییەکانی تر پاڵپشتی بریارەکەیان کرد و بەشدارییان تێداکرد. کوشتاری شاری سنە و مەهاباد، وێرانکردنی گوندەکان و بە کۆمەڵ لەسێدارەدانی کورد نموونەی ئەم کارانەبوون. لە هەمووی خراپتر، کاتێک ئێرانییەکان کچێکی کوردیان بگرتایە پێش ئەوەی لە سێدارەی بدەن دەبوو تەجاوزی پێ بکەن و لە کچەوە بیکەن بە ژن. چونکە بە پێی شەریعەتی ئێرانییەکان کچ نابێت لە سێدارە بدرێت لە بەر ئەوە حەڵاڵ بوو تەجاوزیان پێبکرێت و بە ژن بکرێن. ئەمانە نمونەی ئەو کارانەی ئێرانن دژ بە نەتەوەی کورد، ئیتر بۆچی سەرکردەکانی حیزبی دیموکرات خۆیان بە ئێرانی دەزانن و شانازی پێوەدەکەن؟



(سەربازێکی ئێرانی سەری سمکۆی بەرز کردوتەوە پاش شەهید کردنی)

## 3- بزووتنەوەی کورد بە کاردانەوەیەکی سروشتی دەست پێدەکات

ئێران بە زۆر کوردستان داگیر دەکات و کورد راپەرین دەکات بۆ سەربەخۆیی. ئەمەش قانونی کاردانەوەی سروشتە بۆ مانەوە و خۆ پاراستن. ئەو بزوتنەوانەی لەپێش جەنگی جیهانی دووەمدا دروست بوون، زۆربەیان ئامانجیان سەربەخۆیی کوردستان بوو. راپەرینەکانی

خانی لەپ زێڕین، شێخ عبیداللەی نەهری، بزووتنەوەی سمکۆی شکاک و شێخ مەحمود و چەندی دیکە نموونەی تێکۆشانی دروستکردنی دەوڵەتێکی سەربەخو بوون.

لەکاتی جەنگی جیهانی دووەمدا چەند گروپ و کۆمەڵە و ڕێکخراوی سیاسی دیکە دروست بوون کە ئامانجی ئەمانیش دروستکردنی دەوڵەتی سەربەخۆی کوردستان بوو. کۆمەڵەی ژ.ک یەکێک بوو لەم ڕێکخراوانە. ژ.ک ڕێکخراوێکی بە دسیپلینی شێوە مۆدێرن بوو لە کاتی خۆیدا، لەباری فکریشەوە بۆچوونێکی ناسیۆنالیزمی نوییان هەڵگرتبوو. ئامانجی ژ.ک پێکهێنانی دەوڵەتێکی ناسیۆنال بوو نەک تەنها لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان بەڵکو لە هەموو بەشەکاندا. هەر بۆئەم مەبەستە هەوڵی پێکهێنانی ڕێکخراوی سەربەخۆییان لەبەشەکانی دیکەشدا دەدا. ئامانجەکانی کۆمەڵەی ژ.ک دەتوانین لەو نامەیەدا کە بۆ مەلا مستەفایان ناردووە بەئاشکرا ببینین:

( براعتی سەورەی ئێوە چیە ئایا ئیدیعای ئازادی کوردستانی عیراق دەکەن وە یاخود هەمو کوردستانی گێتی زیمنەن کوردستانی تورکیا.. ).

(ڕەئی ئێمە ئەوەیە کە سەورەی موقەددەسی ئێوە ناوێکی عومومی وەربگرێ یەعنی ئیدیعای ئازاد کردنی هەمو کوردستان بکەن... )( 10 ).

بەڵام مەلا مستەفا وەڵامی بۆ کۆمەڵەی ژ.ک. نەبوو.

بزوتنەوەی کورد تا کاتی ژ.ک. خودکار بوو، دەستی بێگانەی تێنەکەوتبوو، لەسەر ڕێگای دەوڵەتی سەربەخۆ دروست دەبوو و گەشەی دەکرد. بەڵام کاتێک بزوتنەوەکە سەربەخۆیی خۆی بۆ هێزێکی بێگانە لە دەست دا ئامانجی سەربەخۆیی کوردستانیشی لەلایەن ئەو هێزە بێگانەیەوە لێ سەندرا.

## 4 ـ بزووتنەوەکە لەڕێبازی دەوڵەتی سەربەخۆ لادەدرێت

بە پێچەوانەی هەموو نەتەوەیەکی ژێردەستەوە پرۆسێسی فکری ناسیۆنالیستی و سیاسەتی سەربەخۆیی بوون لە کوردستاندا بەرەو لەناوچوون دەبرێت. بزوتنەوەکەش لە قانونی سروشتی مانەوە و خۆ پاراستن لا دەدرێت.

لەسەرەتای ساڵەکانی چل دا هەستی ناسیۆنالیستی لەناو خەڵکیدا بەهێزتر دەبوو، کۆمەڵەی ژ.ک بە خێرایی پەرەی دەستەند. بەهۆی هەلومەرجی جەنگی جیهانی و داگیرکردنی ئێران لەلایەن ئینگلیز و سۆڤیەتەوە، خەڵکی هیوای سەربەخۆ بوونی کوردستانیان پەیدا کرد. سەرکردەکانی ئەو کاتەی ژ.ک لە کەسانی خوێندەواری شارنشین پێکهاتبوون. هاتنی قازی محەمەد کە لە بنەماڵەیەکی مەلازادە بوو، ڕۆڵی تایبەتی لە گۆڕینی سیاسەت و شێوەی پێکهاتی ( ژ.ک. ) دا بینی.

بەڵام هۆی سەرەکی لادان لە سەر ڕێگای دروستکردنی دەوڵەتی سەربەخۆدا، کاریگەری و دەستێوەردانی سۆڤیەت بوولەکاروباری کوردستاندا. سۆڤیەت نەی دەویست ئێران پارچە ببێت و پەیوەندی خۆی لەگەڵ وڵاتانی ناوچەکەدا تێک بدات. بەتایبەتی پەیمانی بۆ دەرهێنانی نەوتی باکوور لەگەڵ ئێراندا بەستبوو.

سۆڤیەت لە کۆتایی جەنگدا قازی محەمەد و هەندێ کەسی عەشایری ناوچەکەیان بۆ باکۆ بانگ کرد، لەوێ جعفر باقرۆڤی نوێنەری سۆڤییەتیان بینی. (کاربەدەستانی سۆڤیەتی باسی گۆڕینی ناوی کۆمەڵەی ژ.ک و شێوەی کارکردنیان لەگەڵ کردن. داوایان لە قازی و هاوڕێکانی کرد ، لە باتی ژ.ک، ڕێکخراوێکی جەماوەری نوێ بە ناوی حیزبی دیموکراتەوە دابمەزرێنن و، زۆری سەرانی ئێلە کوردەکان لەم حیزبەدا کۆبکەنەوە و، لەباتی کاری ژێرزەمینی، کاری سیاسی و کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیری ئاشکرا بکاو، گۆڤارو ڕۆژنامە بڵاو بکاتەوە( 11 ).



بەم شێوەیە دامەزراندنی حیزبی دیموکرات کە بە داوای سۆڤیت دروست کرا، بوو بە هۆی لەناو بردنی بیری ناسیۆنالیزمی کوردی و گۆڕینی ئامانجی دروستکردنی دەوڵەتی سەربەخۆی کوردستان بۆ خودموختاری. ئەم داخوازییەش، واتە مانەوە لە ناو سنووری ئێراندا و قەبوڵکردنی دەوڵەتی ئێران وەک وڵاتێکی خۆیی نەک داگیرکەر. بەم شێوەیە هەستی خۆ بەئێرانی زان لە ناو کورد دا بناغەی بۆ دانرا. هەرچەندە کۆماری کوردستان مەرجەکانی دەوڵەتی سەربەخۆی تێدا بوو، بەڵام لەبەرئەوەی حیزبی دیموکرات و حکومەتەکەش لەلایەن سۆڤیەتەوە بڕیاری خودموختارییان پێ ڕاسپاردبوون، نەیان دەتوانی داوای دەوڵەتی سەربەخۆبکەن. ئەمان لە پراکتیکدا دەوڵەتی سەربەخۆ بوون بەڵام لەناو چوار چێوەی ئێراندا کە پادشایی بوو،

داوای خودموختاریان دەکرد. ئەم ڕاستییەش لەم گفتوگۆ ڕۆژنامەییەی قازی موحەمەددا دەردەکەوێت:

پرسیار: لە تاران دەڵێن کوردان بە ڕەهبەری جەنابت جوێ بونەوە و ئیستیقلالی کوردستانیان دەوێ: ئایا ڕاستە؟

وەلام: خەیر ڕاست نیە: لەبەرئەوەی کە ئێمە لە دەولەتی ئێران ئیجرای قانونی ئەساسیمان دەوێ و دەمانەوێ بە خودموختاری لەژێر بەیداغی ئێران دا بژین، وە خودموختاریشمان وەگیر کەوتوە( 12 ).

هێزەکانی پێشمەرگە خۆیان ئامادەکردبوو بچن شارەکانی وەکو سەقز و سنە و کرماشان ئازاد بکەن بەڵام قازی محەمەد ڕای گەیاند کە نابێت هێزی پێشمەرگە هێرش بکاتە سەر دوژمن چونکە لەگەڵ حکومەتی ئێران لە وتووێژدان. لەگەڵ ئەوەشدا حیزب ئامانجی دەوڵەتی سەربەخۆی گۆڕی بە خودموختاری بەڵام حکومەتی ئێرانلەسەر داگیرکردنەوەی کوردستان سوور بوو. پاش ڕوخانی کۆمار ئیتر کۆتایش بە کاری حیزبی دیموکرات هات. هەندێک لە ئەندامەکان بۆ گەرمیان و هەندێکی دیکەشیان بۆ دەرەوەی وڵات چوون. بەڵام دروشمی دیموکراتی بۆ ئێران و خودموختاری بۆ کوردستان بووبە ئامانجی سەرەکی و ستراتیژی کاری حیزب.

## 5 ــ دیموکراتی بۆ ئێران!

سەربەخۆیی و ژێردەستی ولاتی داگیرکراو بە دیموکراتی و دیکتاتۆری ولاتی داگیرکەرەوە نەبەستراوە. فەرەنسا وڵاتێکی دیموکراتی بوو کە ڤیتنام و جەزائیر و هەندێک ولاتی دیکەی لە ژێر دەستدا بوو یاخود دەیخستە ژێر دەستی خۆیەوە. ئیسپانیا وڵاتێکی دیموکراتییە کە ناهێڵێت باسکەکان سەربەخۆبن و جودا ببنەوە.

تاقیکردنەوەی سەربەخۆبوونی وڵاتانی ژێردەست نیشانی داوە کە نەتەوە داگیرکراوەکان خەباتیان بۆ سەربەخۆبوونی ولاتی خۆیان دەکرد نەک بۆ گۆڕینی ڕژێمی سیاسی لە ولاتی داگیرکەردا. خەڵکی ڤیتنام بۆ زیاتر دیموکراتیکردنی ولاتی ئەمەریکا و خەلکی جەزائیریش بۆ ڕوخاندنی ڕژێمی فەرەنسا خەباتیان نەدەکرد. ئەمڕۆ خەڵکی باسک لەسەر شێوەی ڕژێمی دەسەڵاتدار لە ئیسپانیادا گفتوگۆناکەن،بەڵکو خەبات بۆ سەربەخۆیی و جودابوونەوە لە ئیسپانیا دەکەن. کەواتە بۆچی حیزبی دیموکرات دروشمی دیموکراتی بۆ وڵاتی ئێرانی داگیرکەر داوا دەکات نەک سەربەخۆیی بۆ کوردستان؟ ڕژێمی مەرکەزی ئێران لە ناوخۆی ئەم وڵاتەوە دەڕوخێت نەک لە کوردستانەوە. وەکو چۆن ڕژێمەکانی ئەمریکاو فەرەنسا لە ڤیتنام و جەزائیرەوە نەڕوخان. خەڵکی فارس خۆیان بڕیار دەدەن چ شێوە ڕژێمێک لەسەر کار بێت نەک خەڵکی کورد. سەربەخۆیی کوردستان لە جودابوونەوە و پارچەکردنی ئێراندایە نەک دیموکراتی بۆی. ئایا حیزبی دیموکرات کە داوای دیموکراتی بۆ ئێران دەکات لە خودی حیزبەکەیاندا چەندە دیموکراتن ؟ ئایا حیزب چەند دیموکراتی لە ناو خەڵکی کوردا پەیڕەوکردووە تاوەکو بۆ گەلانی تری ئێرانیشی بنێرێت؟

## 6 ــ خود گەردانی بۆ کوردستان!

خودموختاری واتای سەربەخۆبوون نادات. لەبەرئەوەی حیزبی دیموکرات قەبوڵی سنووری ئێران دەکات لە چوارچێوەی ئێستایدا، کەواتە حیزب ناتوانێت ئێران بە وڵاتێکی دوژمن و داگیرکەر دابنێت بەڵکو بە وڵاتێکی خۆیی. کێشەی کوردیش دەبێتە کێشەیەکی ناوخۆیی نەک نێو نەتەوەیی. کەواتە دژایەتی کورد لەگەڵ وڵاتی ئێراندا نابێت بەڵکو لەگەڵ ڕژێمە مەرکەزییەکەیدایە. بەڵام ئەوەی ئاشکرایە هەر ڕژێمێک دێتە سەرکار بەبێ جیاوازی ئیدیۆلۆژیەکەیان هەمان سیاسەتی لەناوبردنیان دژ بە نەتەوەی کورد دەبێت.



( قاسملو لە چوارچرای مەهاباد ساڵی 1979 )

داخوازییەکانی بزووتنەوەی دەیان ساڵەی حیزبی دیموکرات لە دانوستادنەکەی ڤییەنادا دەردەکەوێت. عەبدولڕەحمانی قاسملو دەڵێت: "ئێمە بە چوار خاڵی سەرەکی باوەڕمان هەیە: یەکەم ئەوەیە خودموختاری واتە نامەرکەزی حکومەت. مەوزوعی گرنگی دووەم بۆ ئێمە زمانی کوردییە. کوردی با زمانی ڕەسمی ناوچەی کورد نشینەکان بێت. مەسئەلەی سێهەم، دەستنیشان کردنی سنووری ناوچەی خودموختارییە. بۆ ئەمە با هۆکارە جوگرافی، ئابوری و بە تایبەتی خواستی خەڵکی ناوچەی کورد نشینەکان لەبەرچاو بگیرێت. مەسئەلەی چوارەم بۆ کوردەکان مەسئەلەیەکی بناغەییە: ئاسایشی ناوچەی کوردنشینەکان با بەهۆی کوردەوە بەڕێوە ببرێت" ( 13 ).

حیزبی دیموکرات نرخی نەتەوەی کوردیان هێندە پێ نزمە، داوا لە ئێرانییەکان دەکەن خودموختارییەکەیان لە نوێژی هەینی و لە ناو مزگەوتەکاندا نەک لە دەزگا نێونەتەوەییەکاندا بۆ ڕابگەیەنن.

د. مەحمود عوسمان دەڵێت: "یەکێک لەو خاڵە سەرەکیانەی لە دانوستاندنی ساڵی 1974 دا لەگەڵ ڕژێمی بەغدا ڕێکنەکەوتین، دەستنیشانکردنی سنووری ناوچەی ئۆتۆنۆمی بوو کە بووبە هۆی شەڕ دەست پێکردنەوە" ( 14 ). بەڵام قاسملو پازدە ساڵ دوای ئەوە، واتە لە دانوستاندنی ساڵی 1989 دا لە ڤیەنا بە ئێرانییەکان دەڵێت: " بۆ

ده‌ستنیشان کردنی سنووره‌کان ڕاسته بۆچوونی جیاواز هه‌یه، به‌ڵام ئه‌گه‌ر ئێوه مه‌سئه‌له‌ی سه‌ره‌کی قه‌بوڵ ده‌که‌ن ئێمه بۆ شتی لاوه‌کی شه‌ڕ ناکه‌ین" ( 15 ). سنووری خودموختارییه‌که له داخوازییه‌کی سه‌ره‌کییه‌وه ده‌گۆڕدرێت به شتێکی لاوه‌کی. ئایا سنووری ئه‌و کوردستانه کامه‌یه که حیزب ده‌یه‌وێت خودموختاری بۆ وه‌ربگرێت؟ چ کاتێک ئه‌م حیزبه "خۆ به دیمکرات زانه" پرسیاریان به خه‌ڵکی کورد کردووه که داخوازییه‌کانی چییه؟ داخوازییه‌کانی خه‌ڵکی کورد ئه‌و چوار خاڵه‌ن که حیزبی دیموکرات دانوستاندنیان له‌سه‌ر ده‌کات؟

## 7 ـ حیزب پاکانه ده‌کات

سه‌رکرده‌کانی حیزبی دیموکرات یه‌ک له دوای یه‌ک به‌ئاشکرا خۆیان و نه‌ته‌وه‌ی کوردیان به ئێرانییه‌کی ڕه‌سه‌ن داناوه و ئێرانیشیان به وڵاتی عه‌زیزی خۆیان له قه‌ڵه‌م داوه نه‌ک به وڵاتێکی داگیرکه‌ر و دوژمن. عه‌بدولڕه‌حمانی قاسملو ده‌بێژێت :



"ئێمه ئیجازه به‌هیچ ئێرانییه‌ک ناده‌ین که خۆی له ئێمه به ئێرانیتر بزانێت"

حیزبی دیموکرات ئه‌م وته‌یان کردووه به دروشمی ئێرانچێتی خۆیان و دژی تاوانی جوداخوازی به‌کاری ده‌هێنن. که‌چی به‌م حاڵه‌شه‌وه کۆمۆنیست و مارکسیسته کورده‌کان مۆری ناسیۆنالیستیان لێ ده‌ده‌ن و ده‌وڵه‌تی ئێران و ڕێکخراوه ئۆپۆزیسیۆنه ئێرانییه‌کانیش حیزبی دیموکرات و سه‌رکرده‌کانی به جوداخواز تاونبار ده‌که‌ن. به پێی پرنسیپی سیاسی هه‌رحیزبێک که ناسیۆنالیستی کورد بێت خۆی به ئێرانی دانانێت، حیزبێک جودایی خواز بێت داوای خودموختاری ناکات، حیزبێک دیموکراسی تیدا بێت پرس به خه‌ڵکه‌که‌ی ده‌کات. به‌ڵام ئه‌وه‌ی ئاشکرایه حیزبی دیموکرات هیچکام له‌م پرنسیپه سیاسیانه‌ی تێدا نییه. له‌گه‌ڵ ئه‌وه‌شدا حیزب بۆ ئه‌وه‌ی بێگوناهی خۆیان له‌م تاوانی جودایی خوازییه بسه‌لمێنن، زیاتر له‌سه‌ر پارێزگاری یه‌کێتی خاک و سنووری ئێران سوورن.
مه‌لا عه‌بدوڵلا سکرتێری گشتی حیزب پاکانه بۆ خۆی و حیزبه‌که‌ی ده‌کات و له گوتوبێژێکدا ده‌ڵێت "ئه‌م له ئێمه ئێرانیترانه! له مێژه که چه‌کی ژه‌نگاوی تۆمه‌تی ته‌جزییه ته‌ڵه‌بییان دژی ئێمه و گه‌لی ئێمه گرتووه به ده‌سته‌وه .. له ڕابردوودا خه‌ڵکی کوردستان بۆ به‌رگری له سه‌ر به‌خۆیی و یه‌کپارچه‌یی ئێران هیچ کاتێک له هاوڵاتیانی دیکه‌ی دوا نه‌که‌وتوون. ته‌وای ئه‌وانه‌ی که تۆمه‌تی ته‌جزییه ته‌ڵه‌بی بۆ ئێمه هه‌ڵ ده‌به‌ستن به جوانی ئه‌مه ده‌زانن، ئه‌وانه ده‌یانه‌وێ به‌و چه‌که ئێمه بتۆقێنن تا له خواستی ڕه‌وای خودموختاری کوردستانی ئێران له چوار چێوه‌ی ئێرانێکی سه‌ربه‌خۆ و دیموکراتدا ده‌س هه‌ڵگرین، که به‌ڕاستی خه‌یاڵێکی خاویان کردووه، هه‌ر وه‌ها له ناخی دڵه‌وه ئه‌سه‌ف ده‌خۆم بۆ ئه‌وانه‌ی که خۆیان له ئێمه به ئێرانیتر ده‌زانن و ئێمه به‌وه تاوانبار ده‌که‌ن که هه‌وڵ ده‌ده‌ین بۆ ته‌جزییه‌ی ئێران" ( 16 ). له‌گه‌ڵ ئه‌م هه‌موو پاکانه‌و ڕاستیانه‌ی که ده‌یسه‌لمێنن حیزبی دیموکرات بۆ یه‌کێتی خاکی ئێران هه‌وڵ ده‌دات نه‌ک بۆ سه‌ربه‌خۆیی کوردستان، که‌چی دوژمنه‌کان به ده‌وڵه‌ت و ئۆپۆزیسیۆنیانه‌وه باوه‌ڕ به‌م حیزبه ناکه‌ن. ئه‌مه‌ش ته‌نها ئه‌وه پیشان ده‌دات که ئێرانییه‌کان له‌به‌ر داخوازی جودابونه‌وه یاخود خودموختاری نییه که قه‌تلوعامی کورد ده‌که‌ن. فشاری ئێران له پێناوی ئه‌وه‌دا نییه که کورد داوای مافێکی که‌متر بکات، به‌ڵکو شه‌ڕو کوشتاری ئێرانییه‌کان له‌سه‌رئه‌وه‌یه، که کورد وه‌کو نه‌ته‌وه‌یه‌ک نابێت بمێنێت، به‌ڵکو ده‌بێت له بۆته‌ی ئێرانیبوون دا بتوێنرێته‌وه. ئه‌م ڕاستییه‌ش هێنده گران نییه که حیزبی دیموکرات نه‌توانێت لێی تێگات.

## 8 ـ چاره‌نووسی حیزبی دیموکرات

له‌گه‌ڵ ڕوخانی سۆڤیه‌تدا، دیواری به‌رلین ڕوخاو ڕێکخراو و حیزبه کۆمۆنیسته دروستکراوه‌کانی ده‌ستی سۆڤییه‌تیش لێکهه‌ڵوه‌شان و نه‌ته‌وه‌کانی ژێرده‌ستیان ئازاد بوون. به‌ڵام له کوردستان ئه‌و ڕێکخراو و بیروبۆچوونانه‌ی له‌سه‌ر ده‌ستی سۆڤیه‌ت و وڵاتانی بێگانه‌ی دیکه‌دا دروست بوون، هێشتا ماوون و لێک هه‌ڵنه‌وه‌شاون. گه‌ڕانه‌وه بۆ قانونی سروشتی مانه‌وه و خۆپاراستنی نه‌ته‌وه‌یه‌ک، که له پێکهێنانی ده‌وڵه‌تی سه‌ربه‌خۆدایه، به لێکهه‌ڵوه‌شانی ئه‌و ڕێکخراو و بیرو بۆچوونانه ده‌بێت که به‌ده‌ستی بێگانه دروست کراون. حیزبی دیموکراتیش به قه‌رزداری هه‌زاران شه‌هیدی کورده‌وه خۆی له‌به‌رده‌می ئه‌م بارو دۆخه نوییه‌دا ده‌بینێته‌وه. قاسملو شکستی داخوازی خودموختاری نیشان ده‌دات و له دواهه‌مین دانیشتنی له‌گه‌ڵ ئێرانییه‌کاندا پێیان ده‌ڵێت:" نه‌سلی من نه‌سلی دیموکراتی و خودموختارییه. چاره‌سه‌ر نه‌کردنی مه‌سئه‌له‌ی کورده‌کان له‌وانه‌یه کار به خواستی دورکه‌وتن له مه‌رکه‌زو جودایی خوازی بچێت" (17).

په‌راوێزه‌کان:

1-کورد و عه‌جه‌م، سالح محه‌مه‌د ئه‌مین، ساڵی 1992.( لا-21 )
2-هه‌مان سه‌رچاوه.(لا- 22،21 ) 3-هه‌مان سه‌رچاوه.(لا-26،25،24 )
4-هه‌مان سه‌رچاوه.(لا-27 ) 5-هه‌مان سه‌رچاوه.(لا-31 )
6-هه‌مان سه‌رچاوه.(لا-38 ) 7-هه‌مان سه‌رچاوه.(لا-38 )
8-هه‌مان سه‌رچاوه.(لا-44 )
9-مێهره‌گان، ساڵی 1991، سه‌عید ڕه‌هنما
10-حکومه‌تی کوردستان، نه‌شیروان مسته‌فا ئه‌مین، ساڵی 1993.(لا-79،78 )
11-حکومه‌تی کوردستان، نه‌شیروان مسته‌فا ئه‌مین، ساڵی 1993.(لا-77 )
12-حکومه‌تی کوردستان، نه‌شیروان مسته‌فا ئه‌مین، ساڵی 1993.(لا 170 )
13-کیهان (چاپی له‌نده‌ن)، ژماره 689، ساڵی 1998.(لا 12 )
14- سیمیناری د. مه‌حمود عوسمان، ستۆکهۆلم 980321
15-کیهان (چاپی له‌نده‌ن)، ژماره 689، ساڵی 1998.(لا 12 )
16-هه‌تاو، ژماره 11، سه‌عید سه‌قزی
17- کیهان (چاپی له‌نده‌ن)، ژماره 689، ساڵی 1998.(لا 12 )

## ئامار

# کوردی ڕۆژهەڵات چۆن بیر دەکاتەوە

**مێژووەکە نموونەی ژمارەیەک پارت و ڕێکخراو پیشان دەدات کە بە ناوی میللەتی کوردەوە یان چینی کرێکارەوە دروست کراوون، ئاڵاو لافیتەی جیاواز جیاوازیان هەڵ کردووە، بڕیاری هەمە جۆرەیان داوە، تا چ ڕادەیەک ئەو ڕێکخراوو کەسانە نوێنەری ئەو خەڵکانە بوون، یاخود تا چ ڕادەیەک ویستی ئەوانیان هێناوەتە دی، پرسیارێکە ڕەنگە ئەم جۆرە ئامارە یارمەتی وەڵامدانەوەی بدات.**

### زۆربەی پرسیارلێکراوەکان:

**-کوردستان بە وڵاتێکی داگیرکراو دادەنێن.**

**-ئاڵای ئێران بە ئاڵای وڵاتی خۆیان نازانن.**

**-دەیانەوێت لە کوردستانێکی سەربەخۆدا بژین.**

بە پێی ئامارێک کە لە سەرەتای ئەم ساڵدا لەناو کوردی ڕۆژهەڵاتدا کراوە، ڕێژەی (95٪)ی پرسیارلێکراوکان کوردستان بە وڵاتێکی داگیرکراو دەزانن و ئاڵای ئێران بە ئاڵای وڵاتی خۆیان نازانن. هەروەها (70٪)ی وەڵامەکان سەربەخۆیی کوردستان لە دروستکردنی دەوڵەتی سەربەخۆداو (18٪)ی لە فیدرالیداو لە (12٪)ی لە خودموختارییدا دەبینێت.

لە وەڵامی ئەو پرسیارەدا کە دەخوازییت دەوڵەتێکی سەربەخۆی کوردستان پێک بهێنرێت، ڕێژەی وەڵامی خواستن (99٪)یە.

دەربارەی ئەوەی کە باوەڕیان بەوە هەبێت کە ڕێکخراوەکانی ئێستا بتوانن کوردستان ڕزگار بکەن وەڵامەکان بەم جۆرەیە: 31٪ باوەڕی پێیەتی، بەڵام 55٪ باوەڕی بەوە نیە کە ڕێکخراوەکانی ئێستا بتوانن کوردستان ڕزگار بکەن و 14٪ نازانێت.

### خودموختاریی

ڕێژەی وەڵامەکان بۆ ئەو پرسیارەی کە "ئایا خەبات لە پێناوی "دیموکراتی بۆ ئێران وخودموختاریی بۆ کوردستان" دەتوانێت کوردستان ڕزگار بکات بەم شێوەیە دەرچوو: 25٪ وەڵام دەداتەوە: بەڵێ، بەڵام (75٪)ی دەڵێت نەخێر.

ڕێژەی 19٪ وەڵام دەداتەوە کە "دروشمی دیموکراتی بۆ ئێران و خودموختاریی بۆ کوردستان" ئامانج و خواستێتی و بەڵام 81٪ ئەو دروشمە بە خواستی خۆی نازانێت.

ڕێژەی 70٪ دەیەوێت پشتگیریی لە ڕێکخراوێک بکات کە داوای پێکهێنانی دەوڵەتی سەربەخۆ دەکات و 22٪ دەیەوێت پشتگیریی لە ڕێکخراوی خودموختاریی بکات و 8٪ دەیەوێت پشتگیریی ڕێکخراوێکی دی بکات کە داخوازییەکی تری هەیە.

دەربارەی ئەوەی کە دەتەوێت لە کام وڵاتدا بژیت، 96٪ وەڵام دەداتەوە کە لە کوردستانێکی سەربەخۆدا بژی و 4٪ دەیەوێت لە ئێراندا بژی.

ڕێژەی 51٪ ئەوە بە خیانەت دادەنێت کە ڕێکخراوێکی کورد پارێزگاریی لە یەکپارچەیی خاک و سنووری ئێران بکات، بەڵام 49٪ بە خیانەتی دانانێت.

### ئەوانەی بڕوایان بە حیزبانەکانە چۆن بیر دەکەنەوە؟

ئەوانەی بڕوایان بەم حیزبانەی ئێستا هەیە بتوانن کوردستان ڕزگار بکەن، ئاوا بیر دەکەنەوە:

ڕێژەی 92٪یان کوردستان بە وڵاتێکی داگیرکراو دادەنێت و 8٪یش بە داگیرکراوی دانانێت. ڕێژەی 35٪ سەربەخۆبوونی کوردستان لە دروستبوونی دەوڵەتی سەربەخۆدا دەبینێت و 26٪ی لە فیدرالی داو لە 39٪ی لە خودموختارییدا. ڕێژەی 83٪ ئاڵای ئێران بە ئاڵای وڵاتی خۆی نازانێت، بەڵام 17٪یان بە ئاڵای وڵاتی خۆی دەزانێت.

*کۆنترکت*


خەڵک لە ژمارەکانی داهاتوودا: چۆن کوردستان جێهێشتنی ئێستای باشووری کوردستان دەبینێت؟
چۆن تەماشای منداڵەکانیان لە ئەورووپا دەکەن و چی بۆ ئافرەت داناوە؟
توانیویەتی زیانێکی نوێ دروست بکات، یان کوردبوون لە کۆڵی نە بۆتەوە؟
نووسەرەکان و کتێبی کوردیی چۆن دەبینێت؟

*وەڵام: ژمارەکانی داهاتوو!*

# لوغم: گیروگرفتێکی شاراوەی کوردستان

ئامادەکردنی: هێمن

- زیاتر لە 110 ملیۆن لوغم لە جیهاندا چێندراوە
- هەر مانگەی زیاتر لە 2000 کەس بە لوغم دەمرێت
- بەرامبەر هەر لوغمێک کە دەردێت، 20 دانە دەچێنرێت
- لە سەدا بیستی ناوچە کشتوکاڵیەکانی کوردستانی خواروو، لەبەر لوغم ناتوانرێت بەکاربهێنرێت

هەر بیستودوو دەقەیەک لوغمێک ل. جێگایەکی جیهاندا دەتەقێتەوە و ساڵی (26,000) کەس بە لوغم بریندار دەبن یان دەکوژرێن. لە مانگی دوانزەی ساڵی (1997)دا لە ئۆتاوا لە کەنەدا، نوێنەری نزیکەی (120) وڵات پەیمانێکی مێژوویان ئیمزاکرد کە دەست لە دروستکردن و بەکارهێنان و هەڵگرتنی لوغمی دژەکەس هەڵبگرن. لە وڵاتانی ئەندامی ناتۆ، تەنیا ئەمریکاو تورکیا ئەو پەیمانەیان ئیمزا نەکرد. عێراق و ئێران و سوریاو ئیسرائیل و رووسیاو چینیش پەیماتکەیان ئیمزا نەکرد. لەو کۆبوونەوەیەدا، کەنەدا بڕیاریدا (70) ملیۆن دۆلار تەرخان بکات بۆ ئەوەی لەماوەی پێنج ساڵدا بەکاربهێنرێت بۆ لابردنی لوغم و یارمەتیدانی ئەو کەسانەی کە لوغمیان پێدا تەقیوەتەوە. ژاپۆنیش (80) ملیۆن دۆلاری بۆ هەمان مەبەست تەرخان کرد. پەیمانی ئۆتاوا لەو کاتەوە دەخوات کە (40) وڵات لەوانەی ئیمزایان کردوە دەیخەنە دەستووری خۆیانەوە. ئەو وڵاتانەی ئەم پەیمانەیان ئیمزا کردووە دەبێت لەماوەی چوار ساڵدا هەموو لوغمەکانینان لەناوببەنو ا‌ە ماوەی دە ساڵدا هەموو لوغمە چێندراوەکانیان دەربهێننەوە. ئەو چوار وڵاتەی کە کوردستانیان بەشکردوە ئەم پەیمانەیان ئیمزا نەکرد. بۆیە کورد دەبێت خۆی هەوڵبدات کاریگەریی ئەو لوغمانە کەم بکاتەوە کە ئەم وڵاتانە لە کوردستاندا دەیچێنن.

گرووپی سەرپشتیکەری لوغم (Mines Advisory Group (MAG)) لە مانگی (5)ی ساڵی (1992)ەوە لە کوردستانی خوارووودا کاردەکات. ئەم گرووپە ناوچە لوغمییەکان دەدۆزێتەوەو نیشانیان دەکات، لوغم و قومبەلەی نەتەقیو کۆدەکاتەوەو زانیاری دەربارەی لوغم دەدات بە خەڵکی. لەنێوان ساڵانی (1993 و 1995)دا گرووپی (MAG) بیستویەک هەزار لوغمی دەرهێناوەو زیاتر لە پانزە هەزار (15,000) تەن تەقەمەنی لەناوبردووە. هەر لەو ماوەیەدا (121) ناوچەی لوغمی، کە نزیکەی (1,880,868) مەتر دوجا زەوی دەگرێتەوە، نیشانە کرد. (MAG) تاکە رێکخراوە کە خەریکی لوغم دەرهێنانە لە کوردستانی عێراقدا کە نزیکەی (75,000) کیلۆمەتر دوجایە. لەو ناوچەیەدا سێ ملیۆنونیو کەس دەژی کە (600,000)یان لە چوار هەزار دێی دوور لە شارەکاندا دەژین.

پرۆگرامی ئاگادارکردنەوەی خەڵکی بەرامبەر لوغم لە مانگی (12)ی ساڵی (1992)دا لە پارێزگاکانی هەولێرو سلێمانی و دهۆکدا دەستپێیکرد. ئەم پرۆگرامە، بە شریتی ڤیدیۆو بەرنامەی تەلەفیزیۆن و وێنە زانیاری دەربارەی لوغم بە خەڵک دەگەیاند. بەشێکی ئەم پرۆگرامە تەرخانکرابوو بۆ بڵاوکردنەوەی زانیاری لە قوتابخانەکاندا. تا ئەمڕۆ، (MAG) زانیاری دەربارەی لوغم لە (3,423) لادێو (989) قوتابخانەو دەزگا حکومییەکاندا بڵاوکردۆتەوە. تا ئێستا رێکخراوی (MAG) سەدو بیست (120) هێکتار (یەک هێکتار = دە هەزار مەتر دوجا) زەوی لە (96) کێڵگەی لوغمی پاککردۆتەوە، (2700) جەولەی ئیستیتلاعی لە ناوچەکەدا کردووە بۆ لابردنی لوغم، زیاتر لە (37,000) لوغمی دەرهێناوە، (143,493) دانە (کە دەکاتە (2146) تەن) ماددەی تەقەمەنی "بەتاڵ" کردۆتەوە (لەناوبردووە) و (500) کێڵگەی لوغمی نیشان کردوە.

رێکخراوی (MAG)بە یارمەتی رێکخراوی (ODA)ی بەریتانیو (SIDA)ی سویدیو حکومەتی هۆڵەندیو رێکخراوی (ECHO)ی سەر بە یەکێتی ئەوروپی، لە پێنج بنکەوە لە کوردستان کاردەکات. سیان لەو بنکانە کەوتوونەتە چوارتار هەڵەبجەو پێنجوینەوە لە پارێزگای



**کۆمەڵێک ئافرەت بەلای کێڵگەیەکی لوغمدا دەڕۆن کە ڕێکخراوی MAG دەستنیشانی کردووە.**

سلێمانی. لەبنکەکانی (MAG)، چوار پسپۆڕی لوغم و شارەزایەکی تۆپ و ساروخی نەتەقیو مەشق بە زیاتر لە (200) کەسی کورد دەکەن بۆ دەرهێنانی لوغم لە کوردستان. لە مانگی (9)ی سالی (1996)دا شەش کەسی بەریتانی لەوانەی کە لە (MAG)دا کاریان دەکرد کوردستانیان بەجێهێشت.

کوردستانی خوارو یەکێکە لەو ناوچانەی جیهان کە زیاترین ژمارە لوغمی تێدا چێندراوە. بە پێی سەرژمێری نەتەوە یەککگرتوەکان، لەم بیست ساڵەی دواییدا، نزیکەی پانزە (15) ملیۆن لوغم لەو ناوچەیەدا چێندراوە. بەگوێرەی ئەفسەرێکی عێراقی، لە کۆتایی ساڵی (1990)دا گرووپە بیست کەسییەکەی لە ماوەی بیست ڕۆژدا هەشتا هەزار لوغمی دژەکەسو هێنی دژەدەبابەیان لە ناوچەی زاخۆدا چاند. ئەفسەرێکی دیکە دەڵێت لە نزیک سنووری ئێران، ڕۆژی پێنج هەزار (5,000) لوغمیان بە ئاستەم لە ژێر ڕووی زەوییەوە دەچاند.

لوغمەکانی کوردستان تەنیا لە ناوچە سنوورییەکاندا نین، بەڵکو گەلێک ناوچەی دەوری سێ پارێزگا گەورەکەی کوردستان بە لوغم تەندراون. ئەم لوغمانە گەورەترین بەربەستن لە ڕێگای ئاوەدانکردنەوەی دێو ناوچە کشتوکاڵییەکاندا. بە پێی ڕاپۆرتێکی نەتەوەیەککگرتوەکان، لەسەدا بیست (20%)ی ناوچە کشتوکاڵییەکانی کوردستان لەبەر لوغم ناتواندرێت بەکاربهێنرێت. ئەم لوغمانە گەورەترین زیان بە جووتیارەکانو خێزانەکانیان دەگەیەنن. لوغمەکان بەو منداڵانەدا دەتەقنەوە کە لە کێڵگەکاندا یاریدەکەن، یان بەر ئافرەتانەدا دەتەقنەوە کە بۆ ئاوهێنان و دارکۆکردنەوە دەچنە کێڵگەکان. سەرژمێری (MAG) ئەوە پیشاندەدات کە لە ساڵی (1991)ەوە تا کۆتایی ساڵی (1996) لوغم لە کوردستان (4324) کەسی بریندار کردووەو (2391) کەسیشی کوشتووە.

ڕەی ماککگراس (Rae MacGrath) لە ڕاپۆرتی (Refugee Participation Network)دا لە ساڵی (1994)دا دەنووسێت: لەسەر ڕووی عێراق، دارکۆکردنەوەو ئاوهێنان و زەویکێڵان پڕمەترسیترین چالاکین بۆ لوغم پێداتەقینەوە. منداڵان، لەبەرئەوەی

| | دهۆک | سلێمانی | هەولێر |
|---|---|---|---|
| ژمارەی کوژراو | 125 | 1394 | 607 |
| ئافرەت | ٪4 | ٪4 | ٪4 |
| پیاو | ٪65 | ٪75 | ٪70 |
| منال | ٪31 | ٪21 | ٪26 |
| | | | |
| ژمارەی بریندار | 436 | 2424 | 791 |
| ئافرەت | ٪6 | ٪3 | ٪4،5 |
| پیاو | ٪73،5 | ٪71 | ٪63 |
| منال | ٪20،5 | ٪26 | ٪32،5 |

**خشتەی ژمارە1: ژمارەی بریندارو کوژراو بە پێی دابەشبوونیان بەسەر پارێزگاکانداو بە گوێرەی جنس و تەمەن.**

کەئەوەندە گەورەنین بەتەنیا لەماڵەوە بەجێبهێڵرێن، لەگەڵ دایکیان دەچن بۆ دارکۆکردنەوە. ئەم منداڵانە گەورەترین مەترسی لوغم پێداتەقینەوە دروستدەکەن، چونکە زۆرجار لەگەڵ دایکیان نامێننەوە، بەڵکو جیا دەبنەوەو لەڕێگا لادەدەن. دایکیان بە کۆڵێک دارەوە ناتوانێت شوێنیان بکەوێت و لەدەوری خۆی بیانهێڵێتەوە". ماککگراس دەنووسێت کە: "لەسەر ڕووی عێراق کلتوورێکی لوغم درووستبووە کە زۆر لەو کلتوورە دەچێت کە لە کەمبۆدیا هەیە؛ ئەویش کلتووری قبووڵکردنی لوغمە وەک بەشێک لەژیانی ڕۆژانە. بەئاوەدانکردنەوەی گوندەکان و رووکردنەوە کشتوکاڵ لە کوردستانی عێراق کارەساتی لوغم پێداتەقینەوە زۆر زیادی کرد". لەناوچە سنوورییەکاندا، لەسەدا پەنجای (50%) ناوچە کشتوکاڵییەکان بەلوغم تەندراوە. لەسەدا چلی (40%) زەوی لەپارێزگای سلێمانی، لەبەر لوغم ناتوانرێت بەکاربهێنرێت.

قەبارەو جۆری گیروگرفتی لوغم لە کوردستانداو ئەو بارودۆخە سیاسییەلەقەی ناوچەکەوبێتواناییڕێکخراوەکوردییەکان لەمەسەلەی لوغمدا کۆمەڵێک هۆن کە وا دەکات کوردستانی عێراق تا داهاتوویەکی دووریش بەدەست گیروگرفتی لوغمەوە بتلێتەوە. لەو بارودۆخە لەقەی کوردستاندا، ڕێکخراوی (MAG) ناتوانێت گروپێک لە خەڵکی ناوچەکە دروست بکات بۆ ئەوەی لوغمەکان لاببات و لە داهاتوودا سەربەخۆ کاربکات.

ڕێکخراوی (MAG) ئەرشیفێکی دەربارەی قوربانییەکانی لوغم لە کوردستانی عێراقدا دروست کردووە. لە سەرەتای ساڵی (1992)ەوە تا مانگی دووی ساڵی (1994) لە سێ پارێزگاکەی کوردستاندا، (2126) کەس بە لوغم کوژراون و (3651) کەس بریندار بوون (خشتەی ژمارە 1). بەڵام (MAG) پێی وایە کە ژمارەی کوژراوەکان دوو ئەوەندە دەبن چونکە بەهۆی دووری لادێکان لە خەستەخانەکانەوەونەبوونی ڕێگای هاتوچۆی خێراویارمەتی دەستبەجێی (First Aid) گونجاو، بریندارەکان فریای خەستەخانە



دوو ئافرەتی کورد قاچە دروسکراوەکانیان پیشان دەدەن

ناکەون. لەسەدا سی (30%) ئەو بریندارو کوژراوانە منالن. لەسەدا (65%)ی ئەو بریندارو کوژراوانە لە پارێزگای سلێمانیەوەن کە زیاترین کارەساتی لوغمی تێدا روودەدات.

ئەم ژمارانە لە خەستەخانە گەورەکانی پارێزگای دهۆک و سلێمانی و هەولێر کۆکراونەتەوە. بۆیە هەر بریندارو کوژراوێکی دیکەی لوغم لە لادێ و دەرەوەی شارەکان کە نەگەیشتبنە خەستەخانەکان، لەم ئەرشیڤەدا ناونووس نەکراون. ڕێکخراوی (MAG) لە راپۆرتەکەیدا دەنووسێت کە ناوچەی (چوارتا) زۆرترین کارەساتی لوغم پێداتەقینەوەی تێدا رووداوە. لە چوارتا (672) کەس و لە پێنجوین (647) کەس و نە هەڵەبجە (424) کەس بە لوغم بریندار بوون. ڕێکخراری (Handicap International) رایگەیاند کە لە مانگی یانزەی ساڵی (1991)ەوە تا مانگی دووی ساڵی (1992)، واتە لەماوەی چوار مانگدا شەشسەدو بیست (620) عەمەلیاتی برینەوەی قاچ کراوە. لەوانە چوارسەدو هەشتا (408) دانەیان لەخوار ئەژنۆوە بووەو سەدو چل (140) دانەشیان لەسەروو ئەژنۆوە. ئەم ڕێکخراوە دەنووسێت کە لەو (810) بریندارەی کە ئەندامێکی لەشیان بڕرایەوە، (480)کەسیان بە لوغم بریندار بیوونو تەنیا (58)کەسیان بەگوللە بریناربیوون. هاندیکاپ ئینتەرناشناڵ هۆی برینداربوونی ئەو (278) کەسەی دیکە دیارنیاکات.

بەپێی ڕێکخراوی (Disastor Aid Centre)ی بەریتانی، دوو ملیۆنونیو لوغم لە ناوچەی دهۆکدا هەیە. بەڵام ڕێکخراوی (Save the Children) پیێ وایە کە زیاتر لە پێنج ملیۆن لوغم لەو ناوچەیەدا هەیە. لە پارێزگای هەولێر ئەم کێڵگە لوغمیانەی خوارەوە نیشانکراون: گردی ساردەکان، ئازادی، دەربەند، ناوپردان، شێخ مەولان/کاندیۆوبەرگەر، سیرمین/سینان ناوچەلوغمییەکانی کوردستانی عێراق لەباشوورەوە بۆ باکوور ئەمانەن: خانەقین، دەربەندیخان، قەرەداغ، هەڵەبجە، شارەزوور، پێنجوین، شانازە، مەرگە، قەلەچوالان، پشدەر، بالیسان، حاجی ئۆمەران، چۆمان، سیدەکان، مێرگەسوور، بارزان و زاخۆ (ساهیلا).

ڕێکخراوی (MAG) تاکە ڕێکخراوی بیانیی بوو کە تا ساڵی (1996) لە کوردستانی باشوور خەریکی دۆزینەوەو پاککردنەوەی کێڵگە لوغمییەکان بوو. لە مانگی سێی ساڵی (1996)دا تورکیا ڕێگای نەدا کە ڕێکخراوی (MAG) هێندێک ئامێری لوغم دۆزینەوەو لابردن ببات بۆ کوردستان. ئەو کارە (MAG)ی ناچارکرد کە واز لە دەرهێنانی لوغمەکان بهێنێت وهەموو چالاکییەکانی تەنیا لە نیشانەکردنی کێڵگە لوغمییەکاندا کۆبکاتەوە. پسپۆڕێکی بەریتانی، کە لە ڕێکخراوی (MAG)دا کار دەکات، نارەزایی بەرامبەر ئەو کارەی تورکیا دەربڕیو ووتی: "ئەگەر تورکیا ڕێگای بدایە هێندێک لەو ئامێری لوغم دۆزینەوانە ببەینە ناوچەکە ئەوا چالاکییەکانمان سێقات زیادی دەکرد". لەسەرەتای مانگی سێی ئەمساڵدا (1998)، پیڤۆ ماتتا (Pivo Matta)ی بەڕێوەبەری گشتیی ڕێکخراوی (ECHO)ی سەر بە بازاڕی ئەوروپیی، رایگەیاند کە (2,5) ملیۆن دۆلاریان تەرخان کردووە بۆ بنیاتنانەوەی کوردستان و لابردنی لوغم. وەک بەشێک لە ڕێکەوتنی نەوت-بۆ-خواردن، ڕێکخراوی (UNOPH)ی سەر بە نەتەوە یەککگرتووەکان (UN)، کە کاری دەرهێنانی لوغمە، لەساڵی (1996)ەوە لە کوردستان کاردەکات. ئەم ڕێکخراوە بنکەیەکی مەشقپێکردنی لە ناوچەی گەرمیان کردەوە بۆ ئەوەی زانیاری بدات بەخەڵکی ناوچەکەو فێریان بکات چۆن لوغمەکان دەربهێنن.

**نامەیەکی کراوە**

**ڕۆژ باش!**

وەکو پێشتر ڕامان گەیاند، ئەوەی ژمارەیەکی بۆ دەچێت و وەڵامی نابێت، ئیتر ژمارەیەکی تری بۆ ڕەوانە ناکرێت. بەڵام هەندێک برادەری دەرەوەی سوید، بە هۆی گیروگرفتی چۆنێتیی ناردنی پارەی بەشداریانەوە، نەیان توانیبوو ئابوونەکانیانمان دەست بخەن. ئێمە بۆ ئەو کەسانە ژمارەی "2"ش دەنێرین و ئاگاداریان دەکەین، لە حاڵەتێکدا بەدیلێکی تر نەبوو، دەتوانن یەکسەر پارەکەیان بخەنە زەرفەوەو بۆمانی پۆست بکەن. ئەوانەش کە دەرامەتی پارەکەیان نیە، تکایە با ئاگادارمان بکەن بۆ ئەوەی بڕیارێکی تری لەسەر بدرێت.

"کۆنتراکت" بە پارەی بەشدارانی و دەستەی بەڕێوەبردنی دەردەچێت. دەستەی بەڕێوەبەران ئازادن پارەی خۆیان چۆن سەرف دەکەن. بەڵام کە پارەی بەشدارانی تێکەوت، ئەو ئازادییە نامێنێت و دەبێت لەسەر پرەنسیپ و بەشێوەیەکی ڕاست بەکار بهێنرێت. بۆیە ئاساییە یەکێک نەیەوێت بەشداریی بکات، بەڵام ئاسایی نیە ئێمە ژمارەیەکی تری بۆ بنێرین. تکایە پێچەوانەی ئەم پرەنسیپەمان بە هەڵە لە سەر حساب بکەن!

"کۆنتراکت" 1998.05.12

# هێندێک زانیاریی دەربارەی لوغم



ڤالمارا 69 (Valmara69) لوغمێکی دژەکەسەو ناودز نیە، پێش تەقینەوەی تا بەرزایی ناوقەد هەڵدەبەزێتەوەو لەکاتی تەقینەوەدا دەبێت بە هەزارەها پارچەوە. ئەم لوغمە لە کوردستانی خواروو زۆرە.

## لەسەر وشکانیی دوو جۆر لوغم هەیە:

١- لوغمی دژەکەس. ئەم جۆرە لوغمە بۆ ئەوە دروستکراوە کە مرۆڤی پیادە بکوژێت و بریندار ی بکات. ئەم لوغمانە ماددەی تەقەمەنی کەمیان تێدایەو بەقەبارە زۆر بچوکن (بەقەدەر پاکەتە جگەرەیەک دەبن)و هێندێکیان کێشیان تەنها پەنجا (50) گرامە. ئەم لوغمانە بە شێوەو رەنگی جیاواز هەن و لە ماددەی جیاواز (پلاستیک، ئاسن، ...) دروستدەکرێن. لوغمی دژەکەس بە پەستان، بە راکێشانی وایەرێک یان بە لەرینەوە دەتەقنەوە. هێندێک لەم لوغمانە بەلابردنی پارچەیەک کە لەسەریان دانراوە دەتەقنەوە. ئەم لوغمانە لە دەوری لادێکان، لە قەراغی رێگاکان، لەسەر پردەکان، لەنزیک تاکەدار یان لەقەراغی جۆگەو رووبارەکان دەچێندرێن.

٢- لوغمی دژەدەبابە. ئەم جۆرە لوغمە بەقەبارە زۆر گەورەترەو کێشی دەگاتە پێنج کیلۆ . لەکاتی تەقینەوەیدا ، ئەم لوغمە نەک هەر ئەو دەبابەو زیلانە دەسوتێنێ کە بەسەریدا دەڕۆن، بەڵکو خەڵکی دەوروبەریشی دەکوژێ یان بریندار دەکات.

- زیاتر لە (110) ملیۆن لوغم لە جیهاندا چێندراوە.
- هەر مانگەی زیاتر لە (2000) کەس بە لوغم دەمرێت.
- لە جێی هەر لوغمێک کە دەردەهێنرێت (20) دانە دەچێنرێت. لە ساڵی (1994)دا (100,000) لوغم دەرهێنران، بەڵام دوو (2) ملیۆن دانە چێندران.
- نرخی یەک لوغمی دژەکەس ((Anti-personal (AP)) سێ (3) تا سی (30) دۆلارە. لابردنی لوغمێک (300) تا (1000) دۆلار دەکەوێت. لابردنی هەموو لوغمەکانی جیهان کە (110) ملیۆنە، (33) ملیارد دۆلاری تێدەچێت.
- لوغم زیاتر لە (50) ساڵ بە چالاکیی دەمێنێتەوە.
- منداڵێکی دەساڵان کە بە لوغم بریندار دەبێت بەدرێژایی تەمەنی زیاتر لە بیستوپێنج ئەندامی دەستکرد دەگۆڕێت کە (3,125) دۆلار دەکەوێت. لە زوربەی وڵاتە هەژارەکاندا، پەککەوتەکانی لوغم ژیانیان بە دارشەق بەڕێوە دەبەن.

## کوردستان سۆلیداریتی

**"ئێمە خەڵکێکین زۆر سکاڵاو گلەیی دەکەین و رەفتاری باشەمان کەمە، هەر دەزانین بڵێین حیزبەکان ئاواو بەعس ئەمەی کرد"** ئەمە قسەی سەرۆکی کوردستان سۆلیداریتی، **فوئاد یاسین** بوو.

کوردستان سۆلیداریتی بەهاری 1991 لە لایەن هەندێک پەناهێندەی سویدەوە دامەزرا. ئەم رێکخراوە گەلێک کاریان ئەنجام داوە. هەر لە دروستکردنەوەی گوندو قوتابخانەو دەسگرتنی کەسانی دوای ئەنفالەوە تا دەرهێنانی مین و ئاژەڵ کڕین بۆ جوتیاران.

سۆلیداریتی رەنگە چەند رێگەیەکی هەبێت بۆ پارە پەیداکردن، بەڵام یەکێک لە رێگەکانی ئەمەیە:

**بێستون مستەفا** کە یەکێکە لە ئەندامەکان دەڵێت: **"رۆژێک دانیشتم و ئەمەم لەگەڵ خۆم ساخ کردەوە، من ئەو پارەیەی دەیدەم بە جگەرە دەینێرم لە کوردستان خەڵک پێی بژی".**

ئەوەی ئەم جۆرە رێکخراوە دەیکەن، جگە لەو کارە کۆنکرێتانەی کە دیارن، گەلێک ئەنجامی ترو سودی تر لە بواری سیاسی وکۆمەڵایەتیدا دەبەخشن کە دەیان هێڵینەوە بۆ دەرفەتێکی تر.

### چالاکییەکانی بەشی مین

پاکردنەوەی ٢٦٠٠٠ مین لە ٣٥ کێلگەی گوندەکانی ناوچەی شارباژێڕ و ماوەت

| ناوی گوند | ناوی کێلگە | پانتایی کێلگە | جۆری مین | (مین)ی لە ناوبراو |
|---|---|---|---|---|
| بادانە | بەغلە | ٣٠ دۆنم | P72-V69 -VS50 | ٥٠٠ |
| بەزەرۆ | بەزەرۆ | ٢٠ دۆنم | V69 | ١٢٠ |
| سمایلەدۆڵ | ئالێتریک | ١٠دۆنم | VAR40- V69 | ٢١٥٤ |
| دەشتی‌تلێ | دووباریک | ٢٥ دۆنم | M16- M14 | ٢٩ |
| دەشتی‌تلێ | چاکەبچکۆل | ١٠ دۆنم | VS50-V6 | ٢٥٠٠ |
| = | بارمتوو | ٢٠ دۆنم | VS50-POM.Z | ١٦٧٢ |
| = | شیوی‌سور | ١٥ دۆنم | V69- VS50 | ٢٩ |
| بەردەپان | بەردەپان | ٢٠ دۆنم | M2- V69 | ٩٥٠ |
| سەنگاو | | ١٠ دۆنم | V 69 | ١٦ |
| درێی | | ٢٠ دۆنم | PM 72- V 69 | ٨١٢٠ |
| ئالان قۆز | | ٢٠٠ دۆنم | PMN 72 - V69 | ٨٤٠٠ |
| خەڕێنە | | ٣٧ دۆنم | VS 50 - TYPE 72 | ٢٣٩٥ |

تێبینی : هەموو ئەم (مین)انە لەمانگی گەڵاڕێزان و سەرماوەزدا لەبەردەم کامیرای ڤیدۆ و خەڵکی گوندەکاندا تەقێنراونەتەوە.

# میلەتێکی بێ پەساپۆرت




**ڕیپۆرتاجێک لەگەڵ ڕێبوار ڕەحمەد و دایکی ( ئەحمەد مەجید) دا**

## سنووری یەکەم

ئەحمەد مەجید محەمەد، تەمەن (29) ساڵ، باوکی سێ منداڵ، دانیشتوی گەڕەکی شەهیدانی زەرگەتەی شاری سلیمانی بوو. چێشتخانەکەی "کوردەواری" بەجێ دەهێڵێت، لە گەڵ باجی خاوەری دایکی دا مانگی (97/1)دەگەنە گوندێکی سنور (تورکیا). جەندرمەی تورکی بیانو بە ئەحمەد دەگریت تا بۆ هێنانی پارەی زۆرتر بۆسلیمانی بگەڕێتەوە، چونکە ئەو پارەیەی پێیانە بە قسەی جەندرمەکان، بەشی ئەو سەفەرەیان ناکات. دایک و کوڕ لەوێدا ماڵ ئاوایی لە یەک دەکەن. کوڕ دەگەڕێتەوە بۆ سلیمانی و باجی خاوەریش چەند ڕۆژێک لە گوندەکە دەمێنێتەوە.

_ بارام سەرۆک جەندرمەیەکی تورکی، زۆربەی شەو خۆی دەکرد بە ماڵی خانەخوێکەی باجی خاوەردا. شەوێک بە پێکەنین وخۆشیەوە دانیشتبوو باسی دەستڕاستی خۆی بۆ دەکردن کە چۆن کوردێکی هەڵهاتو بەسواری هێسترێکەوە، بەهەورازێکدا سەرکەوتوەو ئەمیش بە گوللەیەک ملی پێکاوەو هەڵیداوەتە خوارەوەو دەمی بە یەکدا نەداوە. هەر لەم ناوچەیەدا، دوو ساڵ لەمەو بەر (28)کوردی تر کوژرابوون.

باجی خاوەر بە(1700) دۆلارەوە بەهۆی (گەیلانی) ناوێکی قاچاخچییەوە دەگاتە یۆنان، لەوێشەوە بۆلای کچەکەی لە سوید.

ئەحمەدیش بۆجاری دووهەم لە سلیمانیەوە کەوتبووە ڕێ.

شەوی (7/10) بەختیار لە ستۆکهۆلمەوە تەلەفون بۆ ڕێبوار ئەحمەد (زاوای ئەحمەد مەجید)دەکات وپێی دەڵێت کە بەلەمەکەی ئەوان نقوم بووەو (16) لاشە دۆزراوەتەوە، 6 کەسیش ڕزگاریان بووە، (19) کەسیش لە ژێر ئاوەکەدا ماونەتەوە.

ڕێبوار دەگێڕێتەوە:

من بە بیستنی هەواڵەکە نەخۆش کەوتم و نەمدەزانی بەکێدا دەنگم بگەیەنم. نزیکەی (70) تەلەفونی مەیتخانەکانی ئەزمیرو قاچاخچیەکانم کرد، بەلام هیچ کەس لەوانە وەڵامێکی ڕاستییان پێ نەدامەوە. دەیانگوت "ئەوانەی کە نقوم بون هەمویان تورکن". بە مەبەستی ڤیزە وەرگرتن بۆ سەفارەتی تورکیش چووم ، ئەمانیش پێیان دەگووتم: تۆ درۆ دەکەی، چونکە ئەوانەی نقوم بوون هەموو تورکن و تۆش تورکی نازانی. دڵشاد ئەمین تورکیشی دەزانی، توانی بە هەرحاڵێک بێت ڤیزەی 5 ڕۆژ وەرگرێت. ناوبراو خوشک وخوشکەزاو زاوەکەیانی تیاچوو بوو. ڕۆژی (7/15) لە هۆتێلێک لە ئەزمیر لەگەڵ عوسمان خۆشناو، دڵشاد ئەمین، ڕزگار دزەیی، فەرهاد و موحسین دا یەکمان گرتەوە، ئەوانیش بۆ سۆراخی کەس و کاریان گەشتبوونە ئەوێ. لە ڕۆژی (7/16)دا پەیوەندیمان بە مەیتخانە، شارەوانی، حاکم و موخابەراتەوە کرد. ئەو شەش کەسەی ڕزگاریان بووبوو، لای موخابەرات گیرابون بۆئەوەی سنورداشیان بکەنەوە، بەڵام مۆڵەتیان بەئێمە دا کە بیان بینین. بۆ ئەو مەبەستەش ئێمەیان لە ژوورێکدا دانا بۆئەوەی ئەوان بەدەمی خۆیان ڕووداوەکەمان بۆ بگێڕنەوە. هەر یەکێکیش لە ئێمەچاوەڕوانی ئەوەی دەکرد، کەبەشکو کەسەکەی یەکێک بێت لەو شەش کەسەی ڕزگاریان بووە.شەش کەسەکەش ئەمانە بوون:"عوسمان عەلی ئەحمەد، سامان ڕەوف سەعید، پریڤۆ بەهزاد عومەر، چیا هاوار جەلال، ئازاد جەمال و نەجات عەلی". یەک بەدوای یەک، بەگریان و لەخۆدان خۆیان بەژووردا کرد. عوسمان بەدەم گریانەوە ووتی: *"ئەو خەومان لێ ناکەوێت، ئەو ژن ومناڵانەی لەگەڵماندا بوون دێنە خەومان".*

## سنووری دووەم

- باشە لەسەرەتاوە بۆمان بگێڕنەوە با بزانین کارەساتەکەچۆن بوو؟

-ئێمە (78) پەناهێندە بووین، زۆربەمان ژن و منال، لەلایەن ئەم قاچاخچیانەوە(عەونی، شێخ تەها، گەیلانی، سیروان دیسکۆ، کاوە محەمەد ئێرانی و یوسف)ەوە هەمووما‌نیان لە دوو پاسدا لە یەکیان دابوو. بەقسەی قاچاخچیەکان بەلەم حازرکراوەو هیچ موشکیلەیەکی تیا نییە، هەموو کارێکی ڕێگاوبانەکەشیان ساز کردووە.

لە ئەستەمبولەوە بەرەو ئەزمیر کەوتینە ڕێ و لەوێشەوە بۆ سەر ئاوەکەی" ئێجە"ی نێوان تورکیاو یۆنان.لە ڕێگا دووپاسەکە لە یەکتری دابڕان، پەناهێندەکانی پاسەکەی تر، زووتر گەیشتنە کەناری ئێجەو لە ئاوەکە پەڕینەوە. پاسەکەی ئێمەش کەچل کەس بووین، دوو ڕۆژ لەناو دەوەن و کەندەڵانی کەنار ئاوەکەدا، لەترسی ئەوەی نەکەوینە دەست سەربازی تورکیاوە، خۆمان حەشار دابوو. دوو ڕۆژ لە گەرماو برسیەتی و ترس وگوماندا دەژیاین، بە ئومێدی ئەوەی کە قاچاخچیەکان بەلەمێکمان بۆ پەیدا بکەن. ئێوارەی( 7/9) بەلەمێکی بچوکی کۆن وشڕیان بۆ هێنایین. ئێمەش لەخۆشی ئەوەی کە ئەپەڕینەوە ئەوبەر و لەو دڵەڕاوکێ و ترسە ڕزگارمان دەبێت، دەمان گوت بە پێش بێت لە ئاوەکە دەدەین. قاچاخچیەکانیش پێیان دەوتین: *هەموو شتێ بەمەرامی خۆتانە، ئاوەکە ترسی تیا نییەو خامۆش و ئارامە، ئەو بەرەوەشتان یۆنانە، ئاوەکە هەر سێ مەتر قوڵە، بە پێش بێت دەتوانن لە ئاوەکە بدەن. ئێمشەویش لەهەموو*

*شەویک چاکتر وخۆشترە بۆ سەفەر، ئەگەر بە ئاوەکەشدا برۆن تا دەگەنە ئەوبەر، هەر سێ مەتر قوڵە. ئێمەش دەمان گووت: بەس لێرە ڕزگارمان بێت، وا دەزانین سەر لە نوێ لەدایک بووینەتەوە.*

کاتژمێری هەشتی ئێوارە بەلەمەکەیان هێنایە ناو ئاوەکەوەو ئەو پاسەش کە بەلەمەکەی هێنابوو لەسەر گردەکە ڕاوەستابوو چاوەڕوانی دەکرد. من لە نزیک یەکێک لە قاچاخچیەکانەوە ڕاوەستابووم، گوێم لێی بوو کە بە مۆبایل تەلەفون قسەی لەگەڵ ئەوی تریان دەکردو پێی دەوت بایەکێک لەخۆیان خۆی فێری بەلەم لێخوڕین بکات، بە ( 5-10 ) دەقیقەیەک فێری بکەو زوو بەڕێیان بکە با بڕۆن، بەلەمەکەش مەهێڵەرەوە با زوو دەرچن و ڕزگارمان بێت. تەلەفونەکەی داخستەوە و هاتەوە ناو خەڵکەکەو ووتی هەمو شتێکمان ئامادەیەو ڕێگاکەشمان پاک کردۆتەوەو کڕیومانە. هیچ کۆسپێک نیە، تەنها ئەوە نەبێت کە یەکێکتان بێت بۆ ئەوەی فێری بکەین چۆن بەلەمەکە لێبخوڕێت.
ئێمەش هیچ ڕەنگمان پێ نەمابوو، سامان کە خەڵکی سلێمانی و فیتەر بوو، ووتی من لێی دەخوڕم. لە بەلەمەکە نزیک بوینەوە، بەچەند دەقەیەک پێشانی سامانیان دا کە چۆن بەلەمەکە لێ بخوڕێت.
بەلەمەکەش بەلەمێکی بچوکی ڕاوەماسی بوو، لە ڕاستیدا هەر جێگای ( 14 ) کەسی تیادەبووەوە. ئینجا یەکێک لە قاچاخچیەکان ووتی بەلەمەکەش کونێکی بچوکی تێدایە ئاوی لێ دێتە ژوورەوە، ئەتوانن بەم سەتڵەش ئاوەکە فڕێ بدەنە دەرێ. دنیا تاریک بوو، ئێمەش دانیشتین وسەتڵەکەمان بە دەستمانەوە گرت. کاتێک کە سامان ئیشی بە بەلەمەکە کرد دوو خول بەدەوری خۆیدا سوڕایەوەو هاتەوە ڕۆخی ئاوەکەو ماتۆڕەکەی کوژایەوە. قاچاخچیەکە هاتە پێشەوە، ووتی بۆ ئەوەی بەلەمەکە هێڵی خۆی بە ڕاستی وەربگرێت و بە چوار دەوری خۆیدا خول نەخوات ئەم دەسکەی توند بگرە، ئەگەر بتەوێ بەلای چەپدا بڕۆی ئاوای لێ دەکرێت، بەلای ڕاستدا ئاواو ئەگەر ڕاستیش بڕۆیت دەیخەیتە ناوەڕاست. بۆ جاری دووهەم ئیشی بە بەلەمەکە کردەوەو سەتڵەکەشی دایەوە دەستمان. لە ناوی خواو دوعا هیچی ترمان لە بیر نەمابوو هەر یەکەمان لە بەر خۆیەوە دەمی دەجوڵاندو ورتە ورتی بوو.
بەڵام کەوتە ڕێ و پاش پێنج دەقیقەیەک پاشەکەی نیشتە ئاوەکەوەو لوتەکەشی بەرەو ئاسمان، ئێمەش هەر فریای ئەوە دەکەوتین ئاو فڕێ بدەینە دەرەوە. عوسمان ووتی یەکەم کەس من بووم خۆم هەڵدایە ئاوەکەوە و دوابەدوای منیش چەند کەسێکی تر، هەر لە هەمان کاتدا بەلەمەکە لە ئاستی خۆیدا لە ئاوەکەدا نقوم بوو. هەر لە یەک و دوودا بوو کە هاوار هاوارو قوڵپەقوڵپ دەستی پێ کرد. منداڵەکان چەند جارێک سەر ئاو ئەکەوتن، قوڵپەقوڵپیان لێوە دەهات، ئاو ئەچووە دەم و لوتیانەوە و ئەکەوتنە ژێر ئاوەکەو دوای ئەوە چەند بڵقەبڵقێکیان لێوە دەهات ئیتر بۆ دوا جار ون دەبوون. تا ماوەی چارەکێک، تاک تاک دەنگ و هاوار و شڵپەو بڵقەی ناو ئاوەکە مابوون، تا دەهاتیش دەنگەکان کەمتر دەبوونەوە. لەم کاتەدا ئیتر هەندێک لەخنکاوەکان سەرئاو کەوتبوون. لە ڕاستیدا ئێمەش بە لاشە سەرئاو کەوتوەکانەوە خۆمان گرتبوەوە و لەنگەرمان گرتبوو.
چیا جەلال ووتی: ئەحمەد مەجید تا ماوەیەک خۆی ڕاگرت، بەڵام شڵەژا بوو، شڵپەشڵپی زۆر کرد، من پێم ووت خۆتم پێوە بگرە بەڵام قورسایی مەخەرە سەرم، نەوەک نقوم ببم، وەڵامی دامەوەو ووتی:

-باشە بەقوربانت بم. باشە گوناهمان چی بوو، ئاوامان لێ بەسەرهات، چیمان کردبوو خوایە گیان.
پاش ماوەیەک هێندەم نەزانی سەری کەوتبووە ئاوەکەوە، کە سەریم بەرزکردەوە، دیم ئەمیش خنکابوو. ئەوەشم لە بیر نەچێت کە بیڵێم، کاتێک بەلەمەکە کەوتە ژێر ئاوەکەو ئێمە هاوار هاوارمان پێ کەوتبوو، لایتی پاسەکە لەو بەرەوە داگیرسابوو، گوێی نەدایە و ئەو شوێنەی بەجێهێشت. ئێمەش تا دنیا ڕوناک بووەوە بەلاشەکانەوە خۆمان گرتبوەوە و شەپۆلەکانیش هێنابووینە کەنار ئاوەکەو لەنگەرمان گرتبوو.
لە کاتژمێری ( 12 ) ی نیوەڕۆدا هەلیکۆپتەرو بەلەمی تورکی ئێمەی بوراوە و مردووە سەر ئاوکەوتووەکانی کۆ کردەوە.
ئەو شەش کەسەی ڕزگار بوون، بۆ کوردستان سنورداش دەکرێنەوە.
ڕێبوار دەڵێت: بەلەمەکە کە ئەمە جاری دووهەمی بوو، لە کارەساتێکی وا دا بوویێت، لەکەلاوەیەکی شاری ئەزمیردا فڕێ درابوو. لەجاری یەکەمیشدا ( 8 ) کەسی نقوم کردبوو، هەر لەوێشدا ڕۆژی 97/7/9 قاچاخچیەکان بە ( 800 ) دۆلار کڕیبویان.
دڵشاد عوسمان ئەمین دوو ڕۆژ بە بەلەم و غواسە و جیهازی ( ئێ کۆ ئۆ ) لە شوێنی ڕووداوەکەدا کە ( 70 ) مەتر قوڵە، بە دوای بێخاڵی خوشکی و نیاز محەمەدی زاوای و ساوینی خوشکەزای دا گەڕاوە.
( 19 ) کەس لە ژێر ئاوەکەدا نەدۆزرابوونەوە، لەوانە( بێخاڵ عوسمان، نیاز محەمەد و ساوینی کچیان، چوار منداڵی ئەبو عەلی، شوان عومەر، سەلاح، سامان، دوو منداڵی عەقید فارس، دوو منداڵ خوشکەزای ڕزگار دزەیی... )
لە کەنار ئاوەکەدا ( نزیک گوندی کچکک یاخچە )، لەو جێگایەی کە دوو ڕۆژ ئەو خەڵکەخۆیان تێدا حەشار دابوو، مەمکە لاستیک، دایبی، جلی منداڵ و نامەیەکی دڕاوی عەقید فارسی لێ کەوتبوو.



وێنەی ئەحمەد مەجید و خێزانەکەی و لەولاشەوە وێنەکەی بە مردوویی پاش خنکاندنی،

## فایلی مردووەکان لە موخابەراتی تورکیا

لە موخابەرات وێنەی مردووەکان گیراوەو لە فایلێکدا دانراون، هەر فایلەش ژمارەیەکی لێدراوە.
من( ڕێبوار ئەحمەد ) وێنەی ئەحمەد مەجید، عوسمان خۆشناو و هەموو خێزانەکەی کە بریتی بوون لە ژنەکەی و چوار منداڵ ناسییەوە. هەروەها وێنەی عەقید فارس و ژنەکەی و 3 منداڵی، لەگەڵ عەفان و

خدر که لەگەڵ لاشەی(15 )کەسی تردا دۆزرابونەوە. پاش هەوڵ و تکاو پاڕانەوەی زۆر لە لای حاکم، موخابەرات، مەیتخانە و شارەوانی ڕێگەیان پیمان دا کە لاشەکان بەرینەوە.

## گۆڕستانێکی بێ ناو

ڕۆژی( 7/19 ) تابوت، پەت، نایلۆن و دەرمانمان کڕی، لەگەڵ گۆڕهەڵکەندو کارمەندی خاچی سوور چووینە سەر ئەو گۆڕستانەی ئەوانی لێ نێژرابوون. گۆڕستانەکەش شوێنێکی دابڕاو و بەتایبەت شارەوانی بۆئەوانەی نەناسراون داینراوەو جیای کردۆتەوە.

ژمارەی گۆڕەکان ئێجگار زۆرن، بەپێی فیلمی ڤیدیۆیەک لای ڕێبوار، گۆڕی ژمارە ( 801 ) دەبینرێت. هەر گۆڕەش ژمارەیەکی لە سەرە کە لەلای موخابەراتیش بە هەمان ژمارە وێنەو فایلەکانیان پارێزراون.

بەپێی ڕۆژنامەی (الشرق الاوسل)ی ڕۆژی ( 1997.5.17 ) ، لە ساڵی ( 1991 )ەوە تا ئەو کاتە( 854 ) کەس لە ئاوەکەی ئێجەدا خنکاون.

چاوەڕوانی شتێکی ناخۆشە، زۆر کەس خەبەری لەکەس و کاری نییە، ناشزانن چیان لێ بەسەر هاتووە. عوسمان عەلی پور خەڵکی شاری سەردەشت، پەساپۆرتێکی عێراقی پێ بووە، لەژێر ئاوەکەدا ماوەتەوە و کەسوکاری تا ئێستا نەیانزانیوە.

## جارێکی تر سنووری یەکەم

لە هەمان ڕۆژدا تەرمی 11 کەس برانەوە بۆ کوردستان. پاش دوو ڕۆژیش، ئەحمەد لەگردی شێخ ئەحمەدی هەندی بە خاک سپێردرا، ئەم گردەش لەدوای ڕاپەڕینەکەوە بۆتە گۆڕستانێکی گەورە.

لەنێوان ڕێبوار و باجی خاوەری دایکی ئەحمەددا دانیشتبووم لێم پرسین:

- باشە، بۆچی کوردستانتان بەجێ هێشت؟

-خەڵک لەخۆشیدا ڕاناکات، لە تاو ئازارەو شەڕی ناو خۆ ڕامان کرد بەتایبەتی کەحوکمەتی بەعس لە هاوینی1996 هەولێری گرتەوە . خەڵک دوای ژیانێکی هێمن و ئاسودەیی ئەکەوێت بۆ خۆی و ماڵ و منداڵی. هەر ڕۆژێک لە شاردا دەور بگۆڕێت ئەو ماڵەی بە چەرمەسەری و ئەرەقی ناوچەوانت پەیدات کردوە تاڵان دەکرێت. لە دوای ڕاپەڕینەکەوە سێ جار شتی وا ڕوویداوە. بۆچێ مرۆڤ ئەگەر وڵاتەکەی خۆی ئاسایشی تیابێت ڕادەکات؟

ڕێبوار ئەوەشی ووت کە ئەو هەرگیز خۆشیی ڕوناکاتەوە دڵی. ئەوەی سەبورییەکیش بێت بۆ دڵی دایکی ئەحمەد وەرگرتنی پەساپۆرتی پەنامەندەیی سویدیە، بۆئەوەی ئەگەر توانی خۆی بگەیەنێتەوە گردەکەی شێخ ئەحمەدی هەندی و سەر لە گۆڕی کوڕەکەی بدات.



(وێنەی سەربازێکی تورکی لە گۆی دەریای ئێجە)

پەڕینەوە لە ئاوی ئێجەوە، کە بەرێکی بە تورکیاو بەرەکەی تریشی بە یونانەوەیە، وەک یاری کردنە بە ژیان، وەک خەڵکەکە خۆیان دەڵێن: "دەڕۆین یان ماسی دەمانخۆن یان ماسی دەمان خوات".

هەڵهاتنی کورد لە کوردستانەوە بەردەوامەو ئاوی ئێجەش هەر لەبەری دەڕوات، ماسییەکانیش ئێستا بە شتێکی تازە ئاشناو چەشەن.

**ئالان موحەممەد نیسانی 1998**

## ڕۆژنامەی "هەرێمی کوردستان " لەسەر ئەم قوربانییە و قوربانییەکانی ڕێگای هەندەران، چی بڵاو دەکاتەوە؟

" ئاسۆ حەسەن" لە ژێر ناونیشانی ( ساقۆ گیان یان کۆچی هاتوو نەهات )دا، لە ڕۆژنامەی "هەرێمی کوردستان" ژمارەی ( 119) 21|7|1997دا وتارێکی بە وێنەی هەندێک لەو خنکاوانەوە بلاو کردۆتەوە. بەپێویستمان زانی ئەم بۆچوونەش بۆ خوێندەواران بخەینە بەر چاو، ئەمەش بەشێک لەو وتارە :

" لەوەتەی ڕێگەی کۆچکردن بۆ هەندەران وەلایە، لەوەتەی دۆلار پار دەکاو ئەو خێزانانەی یەکێک و دوانیان لە دەرەوەیە و دەوڵەمەند بوونە، لەوەتەی ئەو پیرە کوڕانەی کە هەموو جەستەیان جێ مۆری شەو ڕابواردنی سۆزانی و ژنە نەخۆشەکانی ئەورووپایە و دێنەوەو کیژی مێش پیاهەڵنەگەڕاوی کوردستان( هەر بە دۆلار ) دەکڕن، لەوەتەی بە دۆلار مەرگ دەفرۆشرێ و ڕێژەی دانیشتوانی کورد کەم دەکرێتەوە، لەوەتەی گۆرانی تیاترۆخانەکانی تورکیا لە تەلەفیزۆنەکان پەخش دەکرێ، لەوەتەی سەتەلایت بڵاو بۆتەوە، لەوەتەی هەندێ لە ڕێکخراوە مرۆییەکان هاتوونەتە کوردستان و بە دەستێک خێرمان پێ دەکەن و بە دەستێک و دوو قاچ لێمان دەدەن.. کەڵکەڵەی کۆچی گومان بەرەو هەندەران دەستی پێ کردووە..." ...." بەلام زۆربەیان هیچ پەیوەندیان بە سیاسەتەوە نەبووەو نییە، تەنها بەنیازی خۆش ڕابواردن و پارە کۆکردنەوەو دەوڵەمەندبوون، چی سامانیان هەیە لێرە دەیکەنە قورگی قاچاخچی و تەزویرکارو ڤیزەفرۆش، تا لەوێ ڕسوایی و هەژاری بکڕن و بە خزمەتکاریبژین. سەیر لەوە دایە هەمووش لە دەرەوە داوای پەنابەری سیاسی دەکەن و دەبنە سیاسەت مەداری( هەڵبەتە فاشل ) و دەیانەوێ پەنابەری سیاسییان پێ بدرێ و زۆری دیش پێویست بە باسکردن ناکا." .

# کێ لە شەهیدکردنی "بەرزان و هاوژین" بەرپرسیارە؟



هاوژین



بەرزان

عومەر نوری قادر

**شەو درەنگ بوو، میوانیکی زۆر بۆ ماڵئاوایی کردنم هاتبوون. بەرەبەیانی ڕۆژی داهاتوو کوردستانم بەجێ دەهێشت و بۆ سوید دەگەڕامەوە. هاوژین لەتەنیشتمەوە دانیشتبوو، سەری خستە پەنا گوێمەوەو بە چرپە پێی ڕاسپاردم:**

**بەخاڵم بڵێ ئێمە ئێرە بەجێ ناهێڵین. با پارەمان بۆ بنێریتەوە، من و بەرزانی برام پاسیکی بچوکی پێ دەکڕین و کاری لەسەر دەکەین، بەم شێوەیە دەتوانین دەرامەتی ماڵی خۆمان و پوورو باپیرمانی پێ دابین بکەین.**

هاوژین و بەرزان دوو لاوی تازەپێگەیشتوو، لەسەرخۆو بێدەنگ بوون. لەگەڵ ئەوەی تەمەنیان لەژێر بیست ساڵیشەوە بوو، بەلام کۆمەڵێ ناخۆشی و ژیانی پێشمەرگایەتی و ڕاکەوبردەی شاخ و داخیان دیبوو، کەلەسەرو تاقیکردنەوەی تەمەنیانەوە بوون.
مانگێک کەمتر دوای ئەو شەوە، ئاگری شەڕی ناوخۆ کە نازانم بۆ چەندەم جاربوو، هەڵگیرسایەوە. ئەمجارەیان هەر تەنیا دوو ڕێکخراوە کوردییە شەڕکەرەکە نەبوون، بەڵکو هێزی وولاتە داگیرکەرەکانی کوردستانیش، بە ئاشکرا یان لەژێرەوە، لە هەموو لایەکەوە دەستیان تێ خست بوو.
زوربەی شارەکانی کوردستان هەر ماوەی بەدەست لایەکەوە بوون، کەس نەی دەزانی ئالای کامیان ڕۆژی داهاتوو بەسەربانەکانەوە دەشەکێتەوە! کەس لەسەرو ماڵی خۆی دڵنیا نەبوو. هەموو ترسی گرتن و کوشتنیان لێ نیشتبوو. دڵەخورپەی هەواڵی ناخۆش بەردەوام تێکەڵ بەناڵەو گرمەو تەقە دەبوون. ئەوانەی بیان ویستایە لەو نەهامەتی و ژیانە ناخۆشە ڕزگاریان بێت، تەنیا هەوڵدانی ئەوەیان بوو کە ڕۆڵەو کوڕە گەنجەکانیان دەرباز بکەن. ئەوانیش بەناچاری و بە نائومێدییەوە، بە دڵێکی شکاوەوە، پۆل پۆل ڕێگای ناو دۆڵ و شاخیان ئەگرتە بەر. پشتیان وولاتە ویران و کاولکراوەکەیان و بەردەمیشیان ترسێکی زۆر. بەڵام هەر کۆڵیان نەدەداو ئەڕۆیشتن.
هاوژین و بەرزانیش لەگەڵ ئەو خەڵکەدا بەناچارییەوە بەنیازی ژیانێکی هێمن و ئاسودەتر، بۆ ئاوارەبوون بەرەو سنور ڕێگایان گرتە بەر. بەلام هەنگاوی ڕزگاربوونیان زۆر بڕی نەکرد. خۆیان و (26)هاوڕێیان لە ناو خاکی کوردستان دا، لەسەر سنووری دروستکراوی ئێران و تورکیا، ڕۆژی 1996/10/22 لەلایەن جەردەو خوێنڕێژەکانی سەر سنوورەوە، گیران. دوای ئەوەی هەرچی پارەیەکیان پێدەبێ لێیان دەسەندن، بەقەیتانی پێڵاوەکانی خۆیان دەستیان دەبەستنەوەو دەکەونە دەستڕێژکردنی هەموویان. لە کۆتاییشدا چەند نارنجۆکێک هەڵدەدەنە ناو لاشەکانیانەوە. بەم شێوەیە ئەو دڕندانە کۆتایی بەژیانی پڕلە ناسۆری بەرزان و هاوژین و هاوڕێکانیان دەهێنن.
لە ستۆکهۆڵم ڕۆژی 1996/11/8، خۆپیشاندانێکمان دژی باڵوێزخانەی تورکیا ڕێکخست و نووسراوێکی نارەزاییمان بۆ بردن، بەلام لێیان وەرنەگرتین، چونکە نووسینەکە پەیوەندی بەکوردستان و کوردەوە هەبوو. لای دەستەلاتدارانی تورک، کورد وەک میللەتێک، کوردستانیش وەک خاکێک لەناو فەرهەنگی بیری شۆڤێنییەکانی تورکدا بوونیان نییە. کارەسات و بێشەرمییەکەی دەستەلاتدارەکانی کوردیش لەوەدایە کە بۆ ئاشتبوونەوەو تەبایی دەچنە لای ئەمان و تورکمانەکانیش دەکەنە هێزێکی دەستەلاتدار لەناو جەرگەی کوردستاندا، ئەو کوردستانەی کە گروپە تورکمانەکان بستێکی بە خاکی کورد دانانێن.
سەدامی فاشی پارەیەکی زۆری خستەگەڕ بەمەبەستی چۆڵ کردنی کوردستان. لە ڕێگەی ڕەوکردنی زۆرەملێ و بەعەرەب کردن، هەروەها بەهۆی ئەنفالکردنەوە هەوڵێکی زۆری داو ئەوەی فریا کەوت کردی، ئەوەی مایەوە داینا ڕێکخراوە کوردییەکان بۆی بکەن. ئێستاش لە ژێر سایەی دەستەلاتی ئەم ڕێکخراوە کوردییانەدا، بە ناچاریی هەموو خەڵک لەبەر نەبوونی ئاسایش و لەتاو برسێتی دەیانەوێت کوردستان جێ بهێڵن و چۆڵی بکەن. ئەمانە بەزمێکی وەهایان ناوەتەوە، کە پڕیشکەکەی بەشەکانی تری کوردستانیشی گرتۆتەوە. بەبەردەوامی تەرمی شەهیدانی کورد بەرەو سابڵاخ، دیاربەکر، هەولێر، سلێمانی و شارەکانی تری کوردستان دەبرێتەوە،بەلام دەستەلاتدارەکانی کوردیش مێشێکیش میوانیان نییە.

# بەرەو ڕووی ڕۆژی حەشر دەکریتەوە

**ـ دەستم کرد بە کریان، زانیم کە ئیتر دنیا ئاخر بووە**

**ـ جکە لە ماڵ و مەڕو ماڵاتیان ژنەکانیشیان حەڵتانن**

**ـ پیاوەکان بو ئیمەو ماڵیش بو ئیوە**

**ئا لان موحەمەد**

جاری یەکەم پیاویک لە پشووی خەرمان هەلگرتندا ئەبیت، دەیکوژن. جاری دووەم دایک و کچیکی پانزە ساڵان لە ڕیی کانی دەبن ئاو بهینن، دەیان کوژن. جاری سیهەمیش دوو برا، پانزە و هەشت ساڵ، شوانەمەڕ دەبن دەکوژرین.

بەڵام ئەنفال شتیکی جیاوازتر بوو. لەشکرەکە لەکاتی نانی بەرچاییدا ئەگاتە گوندەکان و دەست ئەکەن بەسوتاندنی ماڵەکان و کوشتنی مەڕوماڵات و گوندییەکان. ئەگەر بگەڕیینەوە بۆ ئەو کاتە، ئاوا دیمەنەکان دینە بەر چاومان:

ناوچەی گەرمیان نیستا لە ژیر ئاگرباران دایە. ناوچەکە کۆدی ئەنفالی (3) ی لێ دراوە. ژن وپیاو و منداڵی دانیشتوانی گوندی کانی قادری خوارو، عەزیز بەگ، ئیبراهیم غولام، کەریم باسم، هەنارە.... هتد هەڵدین.

ئایشێ ئەسکەر بیست ساڵان، خەلکی گوندی شیخ حەمید، کە لەسەر گردەکە دیتە خوارێ لاشەی (25) پیشمەرگە و مەڕ، مانگا و باڵندە دەبینیت، کە بە چەکی کیمیاوی کوژراون. ئایشێ سێ ڕۆژ لە ئەشکەوتیکا بەسەرماو برسیتی خۆی ئەشاریتەوە، لە ڕۆژی دووهەم دا منالی دەبیت. لە گوندەکەی ئایشێ (80) کەس دەبرین بۆ کوشتن. میردەکەی ئایشێ برای و دوانزە خزمی تری بەر ئەنفال دەکەون. گوندی واران (154)کەس، ئیبراهیم غولام (51)کەس، قیرتەسە (61)کەس. شەش خیزانەکەی کونەکوتر (34)کەس، بەنکول (41)کەس، کوندی عەزیز بەگ (92) کەس، کەریم بەسام (22) کەس. ڕوژی 9/4-988 هیرش لە پیبان، کفری و کەلاریشەوە دەست پی دەکات. لەماوەی دوو ڕوژدا لیشاوی سەرباز بو سەر ناوچەکەو کرتنی هەموو ریکاو بانەکان، بومباباران کردن و کوشتن و تاڵان کردن دەست پی دەکات. هەموو ریکاکان وەک توریک دەبەسترین بەیەکەوە، لەبەر ئەوە دەرکردنی کیان کاریکی مەحاڵ بوو. دەشتەکیەکان هەر دەروازەیەکی ڕاکردن و خو ڕزکارکردنیان بدوزیایەوە لە دوا جاردا هەر دەکەوتنەوە دەستی هیزەکانی ئەنفال و دیل دەکران. لە ناوچەی کەرمیاندا زیاتر لە هەمو ناوچەکانی تر پیاو ژن ومناڵ ژیانیان

## ئەنفالی 3 لە (4/7 تا 1988/4/20)

گەرمیان ناوچەیەکی دەشتایی و گرداویی خوارووی کوردستانی ژووروە کە ئەکەویتە نیوانی ( شاخەکیانی قەراخ، جادەی کەرکوک - توزخورماتو )ەوە. قادرکەرەم کە دانیشتوانەکەی (10000)کەس بوو، دەکەویتە ناوەڕاستی ئەم ناوچەیەوە. لە ڕۆژی 1988/4/1 کوتایی هیرشەکانی ئەنفالی (2)ی ناوچەی قەرەداخ بوو. ئەو پیشمەرگە و گوندیانەی کە لە ئەنفالی 1 و 2 دا بەرنەکەوتبوون، ریگای سەخت و سەرما و برسیتی شاخەکەی زەردە بەرەو ناوچەی گەرمیان دەگرنە بەر. لەویشەوە گوندی شیخ تەویل، کە لەبناری شاخەکەدا بوو دەیگرتنە خوی. ڕۆژی 3 تا 5 /4 ئاگربارانی ئەویش دەست پی دەکات. خەلکی شیخ تەویل و گوندەکانی دەورو پشتی و ئەو بیست خیزانەی کە لە عومەر قەلای ناوچەی قەرەداخەوە هەلهاتبوون، پەنا دەبەنە بەر گوندی لالیخان، لەم کاتەشدا ژمارەیان گەیشتبووە (500) کەس. ئەکرەم (18ساڵ)، خەلکی گوندی عومەر قەلا، لە ترسدا خوی لە بەرمیلیکدا ئەشاریتەوە و گرتن و ڕاپیچ کردنی (500) کەسەکە بە چاوی خوی دەبینی کە ئەچنە سەر ژمارەی ئەنفال کراوەکان و ئیتر نابینرینەوە. ئەکرەم بە خوی و بزنەکەیەوە لەچەندەها بوسە و مەترسی گرتن خویان ڕزگار دەکەن و هەرگیز بزنەکەی بەجێ ناهێلیت.

ڕۆژی (7)ی مانگی هیزەکانی حکومەت لە توزخورماتو، کەرکوک، لەیلان، چەمچەماڵ و سەنگاو، بەتوپ و تانک و ڕاجیمەو یارمەتی هیزی هەوایی و هیلیکوپتەر دائەگرنەوە، لە چەند لاوە هیرش ئەبەن و تەوقی ناوچەکە دەدەن تا لە ناوەڕاستی گەرمیان "قادرکەرەم"دا بەیەک دەگەنەوە.

لە هەمان ڕۆژدا هیزەکانی ئەنفال ئەگەنە گوندی وارانی سەروو و خواروو، ئەم دوو گوندەش لە ساڵی (1963) وە، سێ جار لە لایەن حکومەتی عیراقەوە سوتینراون. چەند مانگیکیش پیش هیرشەکانی ئەنفال سێ جار بە هیلیکوپتەر لییان درابوون:

## پیرەژنیک: چوار کوڕەکەم (35) و (41) ساڵە بوون تیاچوون و بەر ئەنفال کەوتن

**کۆنتراکت** 2 ـ 1998

لەدەست دا، زۆربەی ئەوانەی ڕزگاریان بووە لە خواروو پیرەکان بوون، ئەگینا ئەوانەی لەخواروو 70 ساڵەوە بە ژن ومناڵ و پیاوەوە کۆکراونەتەوەو براون بۆ کوشتن.

گوندی قایتەوەن لەسەر ئاوی باسەرە ( 100 ) خێزانی تێدا دەژیا. لە دەنگی بۆمبا و فڕۆکەی سەر گوندی گەراویی هاوسێیان، تەنها بە جلەکانی بەریانەوە منداڵەکانیان دەدەن بە کۆڵیاندا و هەڵدێن. بەڵام سەربازەکان پێش ئەوەی تاریکی شەو دابێت دەگەنە سەریان و دەیان گرن. پیرەژنێک دەگێڕێتەوە: چوار کوڕەکەم 35 بۆ 41 ساڵان بوون بەر ئەنفال کەوتن. تەنها لە ناوچەی خێڵی ڕزخزایی جافدا ( 100 ) گوند بەرکەوتن. ئەو کاتە بهێنەرە بەر چاوی خوت :

ناوچەی گەرمیان هێزێکی بێشوماری تێدایە. هەر گوندێک دێتە سەر ڕێگایان ئاسمانەکەی بە هەلیکۆپتەر دەگرن، فڕۆکەکانیش ناوچەکەی دەور و پشتیان بۆمباران دەکەن. لە خوارەوە ژیان لە گوندەکە دەبڕن. دەنگی بۆمبا و گوللە، فڕەی هێلیکۆپتەر لەگەڵ دەنگی ژیانی ناو گوندەکەدا، هاواری پیاو و تیژەی ژن و گریانی منداڵی گەرمیانی، بارەی مەڕ ، بۆڕەی گاو مانگا، قیرەی تاژو مراوی و شەقەی باڵی کۆتر لەگەڵ دەنگی تێخوڕینی سەربازەکان دا تێکەڵ بە یەک بوون.

هێزی ئەنفال لە دوای خۆیانەوە خوێن و ئاگر و دوکەڵ بەجێ دەهێڵن و ڕوو لە گوندێکی تر دەکەن. کابرایەکی گوندی هەنارە دەڵێت:

بەڕێگاوە بووم بەرەو لەیلان، دنیا تاریک بوو بەڵام گوندەکەم لێوە دیار بوو دەسوتا. دەستم کرد بە گریان. زانیم کە ئیتر دنیا ئاخر بووە.

لە ماوەی هەشت ڕۆژدا، سەعات لە دوای سەعات، گوند لە دوای گوندیان لە گەڵ زەویدا تەخت دەکرد. لە ماڵەکاندا ئەو شتەی بە کەڵک بهاتایە، تراکتۆر، فەرش، فانۆس... مەڕو ماڵات و باڵندەی ماڵی بە تاڵان دەبران. زیلەکان لە کەنار گوندەکەدا ڕیچکەیان بەست بوو. تاڵانیو پیاو و ژن و منداڵەکانیان تێ فڕێ دەدان و پاشماوەی گوندەکەشیان بە دینامیت دەتەقانەوە، دوای ئەمە بەردەوام دەبوون بۆ گوندەکەی هاوسێ. لە قوڵەکانی تریشەوە لەشکر بەرەوە قوڵایی ناوچەکە دەچوون. هەزار کەس لە گوندی فەقێ موستەفا و هەزار لە گوندی مەحمودبەریزاد کۆبوبوونەوە، هەلیکۆپتەر بەسەریانەوە، سەرباز و جاشەکانیش لە زەوییەوە خەریکی تاڵانی و سوتاندنی خانووەکان بوون. تەنانەت کەرویشک و کۆتریشیان بە تاڵانی دەبرد. سەربازێکی بەعسی بە ئەنفالچییەکان دەڵێت: "پیاوەکان بۆ ئێمەو ماڵیش بۆ ئێوە". لە شوێنێکی دیکەدا ئەفسەرێکی ئیستیخبارات دەڵێت: "ئەمانە بۆ مردن دەچن ئیتر پارەو ماڵیان بۆچییە!".

لیشاوێکی پیاو و ژن و منداڵ بەرەو لەیلان دەڕۆیشت خۆیان تەسلیم بکەن بە حکومەت. ژنێک دەگێڕێتەوە " سەربازەکان تەقەیان بەسەرماندا دەکرد، ئێمە پاڕاینەوە و ئەوان ووتیان هیچتان لێ ناکەین". لە لەیلان دوو هەزار کەسیان لە پەرچی ئاژەڵ کردبون، پەرچەکە تەلبەند کرابوو، چواردەوری بە سەرباز گیرابوو و لە ویدا هەشت ڕۆژ لە بەر باران و تەرزەی بەهاردا مانەوە.

ڕەشادی خەڵکی گوندی دارەزی، فەخری ژنی لە جیدا دەکوژن. ئەکبەری کوڕی، سێ کوڕەزای، دوو برازای و شەش منداڵیان تەمەنیان لە نێوان 1 بۆ7 ساڵ بوو، بەر ئەنفال دەکەون.

ڕاپۆرتێکی ئیستیخبارات ناوی 120 گوندی تر تۆمار دەکات. مەحمود تۆفیق مستەفا خەڵکی گوندی باراوە ( 37 ) کەس لە خێزانەکەی، هەروەها پیاوێکی پیری ڕۆخزایی، دوو ژنەکەی، دە منداڵی تەمەنیان 2 بۆ 15 ساڵ، بوک و زاواکانی و شەش کوڕەیان بەر ئەنفال دەکەون.

خەڵکی گوندی قلیجان، کە بۆ گوندی ملەسوورە هەڵدێن. لە دەشتەکەدا دەخەون، یەکێک لەوان دەگێڕێتەوە: "ئەوەندە خەڵک کۆ بووبوونەوە لە ژماردن نەدەهاتن، وەک ڕۆژی حەشر وا بوو کەس کەسی نەدەناسییەوە".

بە هەزارەها دەشتەکیی لە ئالیاوا گیرا بوون یاخود لە بێ چارەییدا خۆیان تەسلیم بە حکومەت کردبوو. ژنێکی پیری گوندی قیرتسە دەگێڕێتەوە: "لەیلای بوکم زۆر جوان و ژیکەڵە بوو، تازە بوک بوو کە سەربازەکان هاتن خۆی فڕێدایە باوەشی منەوە. سەربازەکان بەپاڵ وەلایان خستم و لەیلایان برد". ئەفسەرێکی ئیستیخبارات دەڵێت: "جگە لە ماڵ و مەڕوماڵاتیان ژنەکانیشیان حەڵاڵتانن".

## مەرکەزەکانی ناوچەکە

دوای ئەوەی دانیشتوانی ناوچەی گەرمیان بە دیل دەگرن، لە چەند مەرکەزێکی ناوچەکەدا، قادرکەرەم، لەیلان، ئالیاوە، مەیدان و فەقێ موستەفا کۆیان دەکەنەوە. لە قوتابخانەیەکدا لە قەڵخاڵو. کە دەکەوێتە دەرەوەی قادرکەرەم 2000 کەس کۆ دەکەنەوە. کچێکی گەنج دەگێڕێتەوە: "من، لە یەکێک لە ژوورەکان لە ناو ژنە پیرەکان دا بووم، لە ترساندا دەموچاوی خۆم بەسەرپۆش داپۆشی بوو، بینیم کە چۆن سەربازەکان لە پیاوەکان دەدەن و دەست و چاویان دەبەستنەوە و فڕێیان دەدانە ناو زیلەکانەوە و دەیانبردن".

عەلی حەسەن مەجید، قائیدی فیرقەی یەک، سولتان حەسەن و ئامری هێزەکانی ئەنفال بارق عبداللە( کە لە ساڵی 1991 دا بە گومانی کودەتا بە دەستی سەدام گوژرا ) بە هەلیکۆپتەر دەگەنە قادرکەرەم و ئێوارەی هەمان ڕۆژ خەڵکی بێگوناهی ناوچەی گەرمیان لە تەلەفیزۆنی عێراقیدا وەک تاوانبارو گیرەشێوێنی سەر بە ئێران پیشان دەدەرێن.

## هەموو ڕێگاکان دەچنەوە سەر تۆپزاوا

بەپێی ڕاپۆرتەکانی ئیستیخبارات لە 4/19 دا ناوچەی گەرمیان بەردێکی بەسەر بەردێکییەوە نامێنێت. خەڵکەکەشی بە پیاو و ژن و منداڵەوە دیل کراون و لە مەکەزەکانی ناوچەکەدا بۆ سەفەرێکی تر کۆکراونەتەوە. لە مەرکەزەکانەوە پەیتا پەیتا کاروانی زیلی عەسکەری بەرەو کەرکوک بەڕێ دەکرا ن و لە کەرکوکیشەوە بۆماوەی سەعاتێک

# ئایشێ لە ڕۆژی دووەمدا، لە ئەشکەوتێکدا منداڵی دەبێت

لەبەر دەرکای ئەمن یاخود بارەکای بەعسدا دەوەستان و ڕێکای سەربازگەی توپزاوایان دەکرتەبەر و لەویشدا بارەکانیان خاڵی دەکردەوە. پادگانی توپزاوا پانتاییەکی زۆری داگیر کردووە، بە ژێریشیدا دوو بوری نەوت دەڕوات و دەوریشی بە هوڵی گەورە گیراوە. پیاوێکی حەفتا ساڵ تەنها کەسە کەلە گوندی کەریم بەسام بەجی ماوە و دەگێڕێتەوە: "هەشت نو زیلی داپوشراو بووین کەلە هەمان کاتدا گەیشتین. هەمومان برسی و شەکەت و نیوە مردو بووبووین، چەند ڕۆژێک بوو هیچمان نەخوارد بوو تەنانەت نەشمان دەزانی چ ڕۆژ و چ کاتێکە. ئەمان دەزانی چیمان لیدەکەن. کە گەیشتینە سەربازککە بە بلندگوکان (موکەبەرەکان) پییان گوتین کە تا ئەمرمان پیدەکەن زیلەکان بەجی نەهیڵین. هیچمان نەدەبینی. ماوەی سەعاتێک بەم شیوەیە ماینەوە تا ئەوکاتەی سەربازەکان پشتی زیلەکانیان کردەوە، " لە پیشدا پیاوەکان دابەزن !" لە بەر برسیتی و هیلاکی ئەم دەتوانی بجولیم، دواکەس بووم کە دابەزیم. لە پیشدا کەنجەکانیان دابەزاند و کەلەپچەیان لە دەست کردن".

لە حەوشەی سەربازگەکە ژن و پیار جیا دەکەنەوە، جەلال (45 ساڵ) دەگێڕێتەوە: " بەهەزارەها کوردی تری لیبوو کە لەپیش ئیمەدا گەیشتبوونە ئەوێ، ئەمان دەزانی چی دەبیت. لە ترسدا دەممان لاڵ بووبوو، قسەمان بۆ نەدەکرا. تەنها دەنگێک کە دەهاتە بەرگوێمان دەنگی ئەفسەرەکە بوو کە ناوەکانی لە بلندگۆکەوە دەخویندەوە. "تارانبار عەلی ڕەحمان کوڕی فلان .... تاوانبار موستەفا کوڕی فلان،... تاهیر کوڕی فلان... وهتد". لە حەوشەی سەربازگەکەدا دیمەنەکە زۆر ترسناک بوو ژن و پیاویان جیادەکردەوە. دیسان پیاوەکان بە پیی تەمەن جیادەکرانەوە. منداڵە بچوکەکان، کەمتر لە تەمەنی 15 ساڵ لە لای دایکیان دەهیلرانەوە، 15- 50 ساڵ بەجیا و پیرەکانیش بە جیا. (12) ساڵیکی بەخزو کەلەگەت بەر لای پیاوەکان دەکەوت و (16) ساڵیکی باڵا کورتی لاواز لای دایکی دەمایەوە. ئیستیخبارات گەنجەکانی هەشت، هەشت جیادەکردەوە و گیرفانەکانیان دەپشکنن. تەنها جلەکانی بەریان نەبیت هەموو شتیکیان لیدەسەندن".

ژنێک دەگێڕیتەوە: "کۆمەڵیک سەعات، پارە، پشتین و شانە لەسەر ئەرزەکە بە تۆپەڵی گەورە خڕکرابوونەوە. پیاودڵی بەر دیمەنە دەهاتەکوڵ ".

دوای ناو نوسین و پشکنینی دیلەکان بە پاڵ دەبەن بۆ هۆڵەکان. سەربازگەکە (28) هۆڵی گەورەی کۆنکریتی تیدا بوو، کە هەریەکەیان (30× 6 ) مەتر بوو کە بە دەرگاوپەنجەرەی ئاسن گیرا بوون و هەر هۆڵەی 100-200 کەسی تێ دەخرا. لە هۆڵەکاندا جیگای دانیشتن نەبوو، خەڵکەکە دەبوو بە چیچکانەوە بن، هەر لە هۆڵەکانیشدا میزو پیساییان دەکرد. ئەگەر 5 تا 10 کەسێک بەختەوەر بونایە وبیرانایە بۆ سەرئاو ئەوا ئەو کاتەش سەربازەکان ڕیزیان لیدەبەستن و بە کابل لییان دەدان. عەبدوڵا عەسکەری (62 ساڵ) خەڵکی گوندیی گۆیتەپە کە 150 کەس لە گوندەکەی و (80) خزمی بەرئەنفالی (4) دەکەون .دەڵیت: "لیدانی پیاوەکان کارێکی ڕۆتین و ڕۆژانە بوو ".

دوو جار ڕووی داوە کە سەربازەکان خۆیان دەکەن بە هۆڵی ژنەکاندا و منداڵ و کۆرپەی شیرەخۆرە لەبەر دایکیان دەفڕینن. دایکەکان لە هۆڵەکەی تەنیشتیانەوە گوییان لە گریانی منداڵەکانیان دەبیت.

تەیمور عەبدوڵا ئەحمەد (12 ساڵ)، خەڵکی کوڵەجۆی گەرمیان، لە یەکێک لەم هۆڵانەوە لەگەڵ دایکی. سێ خوشکی، سێ پووری و هەشت پورزای، لەگەڵ ژن و منداڵەکانی تردا دەبرین بۆ کوشتن (بڕوانە ژمارە یەک). هەر لە ژوورەکەی تەیموردا چوار منداڵی 5-9 ساڵی لە برساندا دەمرن.

لیرەدا هەزارەها دایک و منداڵ ئەو ئەشکەنجەیەش دەچیژن کە چۆن لە باوک و برا و میردەکانیان جیا دەکرینەوە و هەر کە ژمارەیان دەگاتە 4000-5000 کەس دیسان ئامادەیان دەکەن بۆ سەفەریکی تر، بۆ کوشتن لە بیابانەکان.

## دوادیمەن

سەعات (4) ی سەرلەبەیانی جوڵە و هاتوهەرا لە سەربازگاکاندا دەست پیدەکات، دیلەکان گوییان لە دەنگی سەرباز و سەیارەکان دەبیت، هەوڵ دەدەن لە کونی کلیلەکەوە تەماشا بکەن بەڵام لەبەر تاریکی هیچ نەدەبینرا. چوار سەعات لە سەرما و ترس و برسیتیدا هەڵدەلەرزین و تەماشایان دەکرد. پیاوە پیرەکانی بەشەکەی دیکە لەگەڵ ژنەکان دەبینن. "سەربازەکان کراسیان لەبەری پیاوەکان دادەکەنن و لییان دەدەن". دوو دوو کەلەپچەیان لە دەست دەکەن و پیاوەکانیان لە پێ دادەکەنن. زۆرجاریش چاویشیان دەبەستنەوە. ئەم کارە تاوەکو سەعات هەشتی ئیوارە بەردەوام بوو.

لە سەربازگاکاندا، سەربازەکان ژمارە لە دەستی دیلەکان دەدەن. عەویز ژمارەی (375 )ی لیدەدەن و لە ژوورێکدا دای دەنین. عەویز لە سەرمادا هەڵدەلەرزیت، ژوورەکەش ئەوتاویبە و سێ پەڵە خوینی تازەش لیبوو. لە سوچەکەدا جامەدانییەکی خویناوی و پاڵتۆیەک و شەرواڵیکی کوردی کەوتووە. عەویز لە کاتی گولەباران کردندا لە چاڵەکانی بیابانەوە خۆی قوتار دەکات "بڕوانە ژمارەی داهاتوو".

کاروانی زیل و سەیارە سەرگیراوەکان نزیکەی 8-12 سەعات بە ڕێگاوە دەبن تا لە چۆڵەوانی بیاباندا بارەکانیان خاڵی دەکەنەوە، لەو شوینەدا شۆفلەکان دەمیان لە هەڵکەندنی لمەکەدایە، چاڵ بە چاڵ هەڵی دەکەنن. دیلەکان ماوەی چەند سەعاتێک لە سەرەی مەرگدا دەبن و لە چاڵەکاندا دوو دوو یاخود بە کۆمەڵ گولەبارانیان دەکەن و سەری چاڵەکان بە شۆفل دادەپۆشن. ئەمەش دوا دیمەن و قورتی ئەنفالە ، واتە "کوشتن".

**دایکەکان لە هۆڵەکەی تەنیشتیانەوە گوێیان لە گریانی منداڵەکانیان دەبێت**

بۆ تێگەیشتن لە مەزنیی تاوانەکانی ئەنفال و شێوەکاری بیرۆکراتی کارگەی کوشتن، بڕوانە ئەم نامە نهێنیە و گێڕانەوەی بەسەرهاتی خۆ قوتارکردنی محەمەد لە یەکێک لە چاڵەکانەوە:

> لە ئەمنی سلەیمانییەوە بۆ مەرکەزی ئەمنی ناوچەی ئۆتۆنۆمی لە کەرکوک
>
> نامەی ژمارە **25163** ساڵڕۆژ **1988/10/29**
>
> بەناوی خوای گەورەو میهرەبان
>
> ئەو ئامارەی لە گفتو گۆیەکی تەلەفۆنیدا داوا کرا بوو، بەم شێوەیەیە: ئەمە کورتەی ژمارەی ئەو چالاکیاتەیە کە پێی هەستاوین. لەسەر داواکاری مەکتەبی عەلی حەسەن مەجید، نۆ تاوانباری گیرەشێوین لەگەڵ هەژدە کەس لە خێزانەکانیان ئیعدام کران، نۆزدە کەسی تر کە لە ناوچە قەدەغە کراوەکاندا گیراون بە پێی شکاندنی فەرمانی ژمارە **4008** ی ساڵڕۆژی **1987/6/20** ئیعدام کران، هەشتاو حەوت گیرەشێوینی تر بڕیاری کوشتنیان لە لایەن دادگای شۆڕشەوە دەرچوو. لە کۆتاییدا، ئەم **2532** کەسەو **1869** خێزان ،کۆی هەموویان **9030** کەس، کە لە هێرشە پاڵەوانەکانی ئەنفالدا گیراون، تێردران بۆ بنکەی هێزی بەرگری" جیش الشعبی" لە تۆپزاوا (کەرکوک).

محەمەد یەکێکە لەو شەش کەسەی کە شایەتی هەر سێ ڕووداوەکانی قۆرتەکەی ئەنفالە. ناوبراو خۆی و خێزانەکەی بە سێ ڕۆژ لە ئالیانی تازەوە نەگاتە گوندی میلقاسم. بە ئاسایی نیوانی ئەم دوو گوندە دوو سەعات کەمترە. ڕۆژی 4/16 لە سەربازگەی قۆرەتو لە دوو ژنەکەی و حەوت منالەکەی جیا دەکرێتەوە، تەنیا ( 3 ) ڕۆژ گل دەدرێتەوە، لەوێشەوە ڕەوانەی تۆپزاوا دەکرێت: " دوو ڕۆژی تر لەوێ گل دراینەوەو کەس لیی نەپرسینەوەو خۆراکیشمان پێ نەدرا". لە ڕۆژی سێیەم دا سەربازەکان خۆیان دەکەن بەو هۆڵەی موحەمەد دا کە (500) کەسی تری تێدا دەبێت. لە ڕۆژی سێیەمدا سەربازەکان دوو دوو دەستی پیاوەکان دەبەستن و بۆ دەرەوەی هۆڵەکەیان کێش دەکەن، "سەیارەکان کە لە دەرەوە لە ڕیزدا بۆ ئێمە وەستا بوون، بەڵەک بەڵەک بوون و یەکی ( 28 ) کەسیان دەگرت". لە دوای نیوەڕۆدا کاروانەکە دەکەوێتە ڕێ. پاش شەش سەعات ڕێ کردن، موحەمەد نازانێت بەرەو کوێ دەڕۆن ، ئەوە نەبێت کە دوا سەعاتیان ڕێگایەکی چاڵ و چۆڵ و تۆزاوی دەبێت. " لە وێشدا کاتێک کاروانەکە ڕاوەستا شۆفێرەکە سەیارەکەی نەکوژاندەوە بەڵام دەنگی گوللەکان هەر دەهاتە گوێم". دنیا تاریک بوو سەربازەکان بە پاڵ دیلەکان فڕێ دەدەنە دەرێ و بۆ دواجاریش گیرفانەکانیان ئەپشکنن، نەوەک پارە یان شتێکی بەنرخ مابێت بەر تاڵانی نەکەوتبێت، لەمەشدا موحەمەد دوا ( 700 ) دینارەکەی دادەنێت. دوای ئەمانەش ئامادەیان دەکەن بۆ کوشتن. سەربازەکە کەلەپچەکەی دەستی موحەمەد، کە بەستراوە بە دەستی پیاوێکی گوندی بابەکرەوە، دەکاتەوەو لە جیاتی کەلەپچەکان دەستی چەپی هەر ( 28 )یان بە پەتێکەوە گرێ دەدات و لە ناو چاڵە تازە هەڵ کەندراوەکەدا ڕیزیان دەکەن. چاڵەکەش هەر پڕ بە پڕی ( 28 )کەسەکە بوو. گرێکەی دەستی موحەمەد باش توند نەکرابوو، بۆیە ئەو توانی مەچەکی لە پەتەکە ڕاپسکێنێ و چرکەی پێش دەست پێکردنی گوللە باران کردنەکە دەرپەڕێتە دەری چاڵەکە. دەری چاڵەکەش دەشتێک بوو گیای بەهار بەرز بوو بووەوە کە خۆی تیا بشارێتەوە، لە هەمان کاتدا گوللەباران کردنی ئەوانەی ناو چاڵەکە بەردەوام دەبێت و چاڵەکە پڕ دەکرێتەوە. موحەمەد چوار ڕۆژ بە بێ خواردن هەڵ دێت و تەماشای خۆر دەکات بۆ ئەوەی ئاراستەی گەرمیان بدۆزێتەوە. ناوچەکە کاکی بە کاکی و بەگەنم چێنرابوو. ئەو شوێنانەی پیا هەڵدێت بە جلی شوانە مەڕەکاندا دەیان ناسێتەوە کە ناوچەیەکی عەرەبییە. دوای چوار ڕۆژ لە پەلو پۆ دەکەوێت و ئەکەوێتە گوندێکی عەرەبییەوە. خەڵکی گوندەکە لە دەوری کۆدەبنەوە و تەماشای دەکەن: "سەیرکە کوردێک لە فرۆکە کەوتۆتە خوارێ. ! " گوندییە عەرەبەکان موحەمەد بەشەق و لێدان ئەگرن و تەسلیمی پۆلیسی دەکەن. بەدیلی دەینێرن بۆ موسڵ، لەوێشەوە بۆ کەرکوک، بۆ سلێمانی، بۆ کەلار، جارێکی تر بۆ سلێمانی... دوا جاریش لە لێبوردنی گشتیی دا بەرەڵا دەکرێت. ئەو هەڵبەستەی کە موحەمەدی لە مردنی دووەم ڕزگار کردو کە لە هیچ کام لەو شوێنانەدا نەی گۆڕی ئەوە بوو " کە ئەو جاشی فەتاح بەگە لە کەلار". ئەمن بۆی ڕوون نەبورەوە و هەرگیز نەیان زانی کە ئەمە کەسێکی "ئەنفال کراوە" لە بەردەستیاندا. موحەمەد توانی بگاتەوە ناومان، بەڵام هیچ کام لە دوو ژن و حەوت منالەکەی نەبینرانەوە.

سەرچاوەکان : ( *The Anfal Campaign Against The Kurds* ) *Middle East Watch* لاپەرە *210، 239 ل 129 - 166*)



ئەو ڕێکخراوانەی دەست دەخەنە دەستی (عەلی حەسەن مەجید) و ئەو کەسانەوە کە کوردیان ئەنفال کرد و دەستدرێژیان کردە سەر ژن و کچە ئەنفالکراوەکان، نەک هەر بەم ڕەفتارەیان پیرۆزبایی لە ئەنفال و ئەنفالچییەکان دەکەن، بەڵکو بەمە ئەوە نیشان دەدەن کە خۆشیان لە بەرەی ئەنفالن.
ئەمانە ڕێکخراوی سیاسی نین. میللەتی کوردیش هیچ کۆنتراکتێکی لەگەڵ ئەم ڕێکخراوانەدا نییە.



# کۆنتراکت و تیۆری سیاسیی نەبوونی دەسەڵاتی حیزبەکان

ناسر حەفید
٩٨/٣/١٩

هەر یەکێک لە ئێمە ئاگای لە قۆنتەراتی خانوو دروستکردن هەیە. خاوەن ئەرز وەکو لایەنێک و بەڵێندەریش وەکو لایەنەکەی تر ڕێکدەکەون لەسەر دروستکردنی خانوویەکی دیاریکراو. لەحاڵەتی باش ڕێکەوتندا مەرجەکانی ڕێکەوتنەکە دەست نیشان دەکرێت و دەخرێنە سەر کاغەزو پێی دەوترێت: کۆنتراکت. دوو لایەن ڕێک دەکەون لەسەر کۆنتراکتێک. بەڵام دوو لایەن هەر دوو لایەنی خانوو دروستکردن نین و کۆنتراکتیش مەرج نیە نوسرابێتەوە. چۆن؟

## باری سەرەتا

مەبەست لەباری سەرەتا لە فەلسەفەی سیاسیدا ئەوەیە کە مرۆڤ لە سەرەتادا لە ڕەوشێکی سروشتیدا، بەرەڵاو ئازاد بێ ڕێکخستنی کۆمەلایەتی ،لەدەرەوەی یاسا و دامودەزگا ،سەربەستلە دەسەلاتێکی سەروو ژیاوە.

## کۆنتراکتی کۆمەڵگا

ئەو ئایدیایەیە کە لای وایە کۆمەڵگا لەڕێگای کۆنتراکتێکەوە دروست بووە کە مرۆڤەکانی "باری سەرەتا" وازیان لە هەندێک ئازادیی خۆیان هێناوە بۆ ئەوەی لەجیاتی ئەوە سوود لە دەسکەوتەکانی کۆمەڵگا وەر بگرن. بەم پێیە بنچینەی مورال و ماف لە کۆمەڵدا دەگەڕێتەوە بۆ کۆنتراکتی کۆمەڵگا (١/ 14). بە پێی ڕۆسۆ، مرۆڤ بە چوونەناو ڕەوشی کۆمەڵگاوە لەباری پێشوی سروشتییەوە، کارەکتەرێکی مورالیی وەردەگرێت کە لەوەو پێش نەیبووە. ئەو کاتە بۆ یەکەم جار ئەرکی سەرشان جێگای بزوێنی فیزیکیی و ماف جێگای ئارەزوو (وەکو مرۆڤ) دەگرێتەوە، کە تا ئەو کاتە هەر بیری لە خۆی کردۆتەوەو بەڵام ئیتر خۆی دەبینێت ناچارە لە پرەنسیپێکی ترەوە هەڵسوکەوت بکات، پێش ئەوەی گوێ لە ئارەزووەکانی بگرێت لە بەردەمی ژیریی خۆیدا ڕابوەستێت (2/ 33).

دەربارەی ڕەوشی سروشتیی "باری سەرەتا" و پێکهێنانی کۆمەڵگا لە ڕێگای کۆنتراکتەوە، فەیلەسوفەکان ڕاو بۆچوونی جیاوازیان هەیە کە بە کورتیی هەندێکیان دەخەمە ڕوو.

## تۆماس هۆبس (1679-1588)

یەکێکە لەوانەی کە لای وابووە سروشتی مرۆڤ نەگۆڕەو زانیاری دەربارەی "ڕەوشی سروشتی" لە زانیاریی دەربارەی سروشتی مرۆڤ جیا نابێتەوە. بە پێی ناوبراو مرۆڤ دوولەتییە، لەبەرئەوە دوو سروشتیشی هەیە: یەکەم شەیدایی و دووەم ژیریی. لە دەرەوەی

**ئەو زاڵم و زۆردارانەی مسیلەتان بە حوکمیان ڕازی نەبوون و هەستاوون لە دژیان، ئەوانە نەبوون سوپای بێگانەیان هێنابێتە سەر نیشتیمانی خۆیان.**

**دەسەڵاتی سیاسیی، دەسەڵاتی بەڕێوبردنی خەڵکەکەی و پاراستنێتی لە مەترسی دەرەوە.**

**دەسەڵاتی حیزبەکانی باشور ڕەوایی سیاسی نە ماوە.**

حکومەت، شەیدایی مرۆڤ بە پێویستییەوە زیاد دەبێت و لە ژێرێتیەکەی بەهێز تر دەبێت. مرۆڤ دەبێتە کۆیلەی شەیدایی و دەیەوێت حەزی لە چی بوو بیکات و هەرچیەکی ویست هەی بێت. لە سەر ئەمە مرۆڤ تێک بەردەبن و بۆیە بە پێی هۆبس باری سروشتی باری شەڕی خەڵکەکەیە دژی یەکتریی، ڕەوشێکی خراپە کە شەیدایی مرۆڤ تیایدا ڕەوتی خۆی وەردەگرێت.

بەڵام خانەی دووەمی مرۆڤ، بە پێچەوانەی شەیداییەوە سروشتێکی تری هەیە کە ژیرییە. ئەم سروشتەی تر مرۆڤ ڕادەکێشێت بۆ کۆتایی هێنان بە شەڕی بێ کۆتایی و هەوڵدان لە پێش هەموو شتێکدا بۆ ئاشتی. ئاشتیش تەنها کاتێک دەتوانن بیگەنێ کە هەموو دەسەلاتێک بخەنە دەستی حکومەتێکەوە، پاشا بێت یان هەر کۆمەڵێکی بەڕێوبەری تر. ئەو کاتەش هەق و ناهەق و خاوەنداریتی ناوەڕۆک وەر دەگرن کە حکومەتێک ڕێک بخرێت. بە ڕستەیەکی تر، سروشتی ژیریی مرۆڤ لە دروستکردنی **"حکومەت"**دا خۆی دەردەبڕێت. ژیرێتی حکومەتیش لە پەیداکردنی **"مافی سروشت"**دا دەردەکەوێت. مافی سروشتیش ئەوەیە کە پیشانی دەدات هاوڵاتییەکان لە حکومەتێکدا چ هەقێکیان هەیە. بەرامبەر بەم مافی سروشتەش نێگەتیڤ **"یاسای سروشت"** هەیە کە پیشانی دەدات هاوڵاتیان چ ئەرکێکیان لەسەرە. بەم پێیە دوو خانەکەی مرۆڤ؛ شەیدایی وژیریی، دوو بەرهەمی ناکۆکیان هەیە. یەکەم ڕەوشی سروشتیی وەحشەتگەریی و دووەمیان ژیریی و ڕێکخستن کە لە "مافی سروشت" و "یاسای سروشت" دا بەرجەستە دەبن.

**هانرو تاپانی کلامی** دەڵێت: "بە پێی هۆبس بناغەیەکی سروشتیی بۆ کۆنتراکتی کۆمەڵگا ترسە. هێزی مانەوەیە لە ژیاندا کە بەهێزترین دەماری جوڵانەوەی مرۆڤە". لە کۆمەڵانی دێریندا هەموو لایەک لە شەڕدا بووە دژی ئەوی تر. ژیان ترسناک، نادیارو کورت بووە. ئەو ترسەی کە هەموو لایەک دەگرێتەوە پەیمانێکی کۆمەڵگای فەرز کردووە. مرۆڤ بۆ ئەوەی بگات بە ئاشتی و دڵنیایی، خۆی دەخاتە دەستی حکومەتێکەوە. بە چونە ناو پەیمانی حکومەتەکەوە واز لەو مافە دێرینانەی خۆی دەهێنێت، کە بە پێی هۆبس لە ڕاستیدا لەو کۆمەڵگایەدا مرۆڤ هیچ مافێکی نیە، چونکە کەس هیچ ئەرکێکی بۆ دانەنراوەو هەر کەسەو دەبێت هەرچی لەدەست دێت بیکات بۆ پاراستنی خۆی. لەم کۆنتراکتەدا، بە پێی هۆبس، مرۆڤ دەبێت واز لەوە بهێنێت کە مافێکی دیارینەکراوی هەبێت بۆ هەموو شتێک، دەتوانێت لە جیاتی ئەوە بە ئازادییەک لەگەڵ ئەوی تردا ڕازی بێت کە لە هەردولاوە بێت (75/4).

هۆبس بڕوای وایە باری سروشتی بەو شێوەیەی کە باری شەڕی خەڵکەکە نەبوبێت و مرۆڤ مافی هەبووبێت تیایدا، داهێنانێکی ئەقڵانییەو لای وا نیە هەموو مرۆڤ لە سەرەتای مێژوودا جارێک لەو باری سروشتیەدا ژیا بێت. دەربارەی ئەوەش کە لە ئەمەریکا خەڵک لە زۆر شوێندا بێ حکومەت ژیاوە، ڕای وابووە کە ئەوە ژیانێکی ئاژەڵییەو دەڵێت بەڵام باری سروشتی هەمیشە لە هەڕەشەکردن دایە. ناوبراو سەردەمی شەڕێکی ناوخۆی، ئەو "باری سروشتیی" ئاسایەی خۆی باسی دەکات، بینیوە کە مرۆڤ لەو ماف و بەرقەرارییە بووە کە پێشتر هەی بووە (117/3). ئەوەی ڕاستی بێت هەندێک جار فەیلەسوفەکان باری سروشتی وەکو تاقیگایەکی فکریی بەکاردەهێنن بۆ گێڕانەوەی هەندێک دیاردە بۆ سروشتی مرۆڤ، یاخود بە پێچەوانەوە، بۆ پیشاندانی ئەوەی کە هەندێک دیاردە سەرچاوەی لە سروشتی مرۆڤەوە وەرنەگرتووە.

## جۆن لۆک (1704-1632)

جۆن لۆک وەکو تۆماس هۆبس باری سروشتیی ڕەش نابینێت. بە پێچەوانەی (هۆبس) ەوە کە لای وابووە نە ماف نە ئەرک نە موڵک، لە باری سروشتییدا نەبوون، لۆک لای وایە یاسای سروشت لە باری سروشتیشدا دەخوات. هۆکاری ئەم بۆچونەشی دەگەڕێتەوە بۆ ڕوانگەیەکی ئاینیی کە خودا هەموو ئەو شتانەی سەر زەوی بە ئاژەڵ و ڕوەکەوە بەخشیووە بە مرۆڤ. مرۆڤ خاوەنی ئەم سامانەیە لە سروشتداو لە سەختیی "خودا"دا بووە کە ژیانی هەموو مرۆڤی پێ بگوزەرێت. ئەم بۆچونەی کە خودا سامانی زەوی بە گوێرەی پێویستیی مرۆڤ خولقاندووە، بەشێکی بنچینەیی بووە لە "فیسیکۆ-تیۆلۆجی" کە بیرێکی کۆنەو ڕۆڵێکی گەورەی بینیووە لە سالانی (1700)دا. بەگوێرەی لۆک، لە باری سروشتیدا هەر مرۆڤەو بەشێکی خۆی هەیە کە یاسای سروشت ئەوەی پێ دەبەخشێت کە دەستی پێوەی بێت. ئەگەر مرۆڤ پەلاماری موڵکی یەکێکی تریشی دا، ئەوا یاسای سروشت دەشکێنێت. **سفێن ئێریک** دەڵێت لۆک باری سروشتیی وەکو بارێکی باش دەبینێت. بەڵام جیاوازیی سەرەکی لە نێوانی ئەو و "هۆبس" دا دەربارەی ماف و یاسایە لە لایەک و حکومەت لە لایەکی تر. بە پێی هۆبس ماف و یاسا بە بێ دەزگای سیاسی بوونی نیە. بەڵام بە گوێرەی لۆک ماف و یاسا لە حکومەت پێکهێنان بنچینەیی ترن. بە پێی هۆبس حکومەت دروست دەکرێت بۆ ئەوەی بتوانرێت ماف و یاسا بخوڵقێنرێت. بەڵام لای لۆک حکومەت تەنها دەتوانێت ماف و یاسا تەسدیق بکات و بیان پارێزێت. بەگوێرەی لۆک ڕەوایی بوونی حکومەت تەنها لەوەدایە کە تاکەکانی لە دەسدرێژیی ئەوانەی خۆی و کەسانی دەرەوە کە یاسای سروشت دەشکێنن، بپارێزێت. باری سروشتی لای لۆک تەنها کەموکوڕییەکی بنچینەیی هەیە کە ئەویش بریتییە لەوەی کە ئەگەر یەکێک یاسای سروشت بشکێنێت ناتوانرێت سزا بدرێت. ئەمە ئەو کەموکوڕییەیە کە وا دەکات پێکهێنانی حکومەت پێویست بێت.

ئێریک دەڵێت هەردوکیان، هۆبس و لۆک لەوەدا یەکن کە حکومەت بۆ ئەوەیە کە پارێزگاریی تاک بکات. بەڵام بە گوێرەی هۆبس تاک هیچ مافێکی بەرامبەر حکومەت نیە، تەنها ئەگەر حکومەت ئاسایش و ئاشتی پێ ببەخشێت. بەڵام بەگوێرەی لۆک حکومەت تەنها ئەو کاتە دەتوانێت داوای ئەوە لە تاکەکانی بکات کە سەر بە حکومەت بن، کە بتوانێت ئەو مافانەیان بداتێ کە لەباری سروشتییدا هەیانە(118/3).

## جان جاک ڕۆسۆ (1778-1712)

بە جیاوازیی لەگەڵ هۆبس، ڕۆسۆ ڕای وایە کە مرۆڤ مەرج نیە لە حاڵەتێکی سروشتیدا بەم شێوەیەی ئێستا پەلامەردەرو دژکار بێت. بە پێی ناوبراو، لە باری سەرەتادا هەر کەسەو بۆ خۆی بێ هاریکاریی ژیاوە. لەم ژیانەشدا دوو پرەنسیپی ئیش بەڕێوەی بردووە. یەکەم بەرژەوەندی گوزەرانی ژیان، دووەم سۆزو هاوهەستیی کە ئامادە نەبوونێک لای مرۆڤەکە دروست دەکەن گران بێت ببینێت هەستیارێکی تر مرۆڤ بێت یان ئاژەڵ، ئازار بچێژێت. ئەم سۆزو هارهەستییەش زگماکییە. ڕۆسۆ دەست بۆ جوڵانەوەی منال، وەکو یەکەم و ساکارترین هەڵسوکەوتی ڕۆحی مرۆڤ، ڕادەکێشێت و دەڵێت ئەوەندە سروشتیە کە ئاژەڵیش هەندێک جار دەی ناسێتەوە. ڕۆسۆ لای وایە تا مرۆڤ ناچاری هاوکاریی یەکتریی نەبووە، ئازاد بووە. کشتوکاڵ و بەرهەم گۆڕینەوە سنووری بۆ ئازادیەکەی داناوە (8/5). ناوبراو بە گشتی دەربارەی گواستنەوە لە باری سەرەتاوە بۆ پێکهێنانی کۆمەڵگا ڕای وایە مرۆڤ لە باری سروشتیدا گەیشتۆتە نوقتەیەک کە کۆسپەکانی ژیان لەبەردەمیدا قورستر بوون لەوەی کە تەنها بە هێزی خۆی بتوانێت بەسەریاندا سەر بکەوێت. ئەو کاتە ئیتر مرۆڤ نەیتوانیووە بەردەوام بێت بە بێ ئەوەی گۆڕانێک بەسەر جۆری ژیانیدا بهێنێت. بەڵام لەبەر ئەوەی کە مرۆڤەکە ناتوانێت هێزێک زیاتر لە توانای خودی خۆی دەر بدات و تەنها دەتوانێت ئەو هێزانە یەک بخات و ئاراستە بکات کە هەن، ئەوا هیچ دەستیاوێکی تری نەبووە بۆ بەردەوامیی ژیان جگە لە یەکخستنی هێزە تاکەکان بۆ یەک هێزی گەورەی کۆکراوە کە بتوانێت بەسەر کۆسپەکاندا سەر بکەوێت و ئەم هێزانە لە یەک هێزی هەڵسوڕێنەردا یەک بخات بۆ کاریگەرییەکی هاوکار. چۆن ئەم هێزە هاوبەشەکارهەڵسوڕێنەرەکە دەسەڵاتێکی سیاسی دەگرێتەوە، بتوانێت چ لە ڕوی ئازادیی و چ لە ڕووی خاوەندارێتیی

**ڕۆسۆ: هەمیشە جیاوازییەکی گەورە هەیە لە نێوانی ئەوەدا کە جەماوەرێک ژێردەستە بکەیت، لەگەڵ ئەوەدا کە کۆمەڵگایەک ببەیت بەڕێوە.**

تاکەکانیەوەپارێزگاریی لەئەندامەکانی بکات.تەشقەڵەیەکی بنەڕەتییە چارەسەرەکەی کۆنتراکتی کۆمەڵگایە (27/2).
ئەم بینینە ئۆرگانیەی ڕۆسو، واتە کە کۆبونەوەی تاکەکان گشتێک دروست دەکەن، وەکو ئەوەی کە ملوێنەها خانەی لەش لە ئۆرگانە جیاوازەکاندا مرۆڤێک پێک دەهێنن، تێگەشتنێکی تر دەدات بە کۆنتراکتی کۆمەڵگا. ڕۆسۆ دنیا وا نابینێت کە لە بواری سیاسیدا وا بکەوێتەوە کۆنتراکت لە نێوانی پادشاو خەڵکیدا هەبێت. بە واتایەکی تر، مەسەلەکە لای ڕۆسۆ ئەوە نیە کە کۆنتراکتی نێوان پادشاو خەڵک بە جۆرێکی تر بێت، بەڵکو **سڤێن نوفە** وتەنی هەر دان بەوەشدا نانێت کە کۆنتراکتی کۆمەڵگا لە نێوانی پادشایەک و خەڵکەکەیدا بێت. لە ڕۆحێکی دیموکراتیەوە، لە جیاتی ئەوە کەسی تاک لە کۆنتراکتێکی کۆمەڵگادا مافی بڕیاردان دەدات بە کۆمەڵگا وەکو گشتێک (14/1). بە پێی ڕۆسۆ: هەر یەکە لە ئێمە خۆی و هەموو هێزێکی دەخاتە ژێر "سەرکردایەتی بالا"ی خواستی گشتییەوە. بەلام ئەمە کەی؟ ئەو کاتەی کە هەر ئەندامێک بەشێکی جیانەکراوە بێت لە گشتەکە. ئەم خواستی گشتییە چیە؟ ئەوەیە کە لە هەمووەوە سەرچاوە وەر دەگرێت و لە پێناوی هەمووشدایە. پێکڕا بڕیاری لەسەر دەدرێت و دەنوسرێتەوە بۆ بەکارهێنانی گشتی. ئەوەی خواستیش دەکات بە گشتی بە بەی یەکەم ژمارەی دەنگەکان نیە، بەڵکو بەرژەوەندیی هاوبەشە کە دانیشتوانەکان یەکدەخات (15/5).
بە پێی ئێریک گرنگترین نۆرمی پەیمانی کۆمەڵگا لای ڕۆسۆ ئەوەیە کە هەموو ئەوانەی دەبێت گوێڕایەڵی یاسایەک بن، پێویستە لە دانانی ئەو یاسایەشدا بەشدار بوو بێتن (140/3). بە پێی **ئەینار ئێریکسۆن**، ڕۆسۆ لای وایە ڕێکەوتنێک بۆ ئەوەی بخوات دەبێت بۆ چاکەی هەموو بێت. لە پەیمانێکی ملکەچییدا خەڵک ئازادیی خۆی دەبەخشێت بۆ هیچ. خەڵکێک بێ مەرج خۆی بخاتە ژێردەستی هەر دەسەلاتێکەوە، هیچ نرخێک لەباتی وەرناگرێت (13/5). ڕۆسۆ دەڵێت وازهێنان لە ئازادیی وازهێنانە لە کارەکتەری خود وەک مرۆڤ. ئەوەی لە لایەکەوە داوای دەسەلاتێکی موتڵەق بکرێت و لە لایەکەی ترەوە ملکەچییەکی بێ سنوور، ڕێکەوتنێکی بێ ماناو ناکۆکە (23/2). ڕۆسۆ دەڵێت: *هەمیشە جیاوازییەکی گەورە هەیە لە نێوانی ئەوەدا کە جەماوەرێک ژێردەستە بکەیت، لەگەڵ ئەوەدا کە کۆمەڵگایەک ببەیت بە ڕێوە* (26/2).

## کۆنتراکت وەکو ئامرازێکی سیاسی دژی زۆردار

بیری کۆنتراکت دەگەڕێتەوە بۆ دەوری ئەنتیک و مێژووی ناوەڕاست. دەوری ئەنتیک (700-480) ساڵ پێش لەدایکبوونی مەسیح دەگرێتەوەو مێژووی ناوەڕاستیش دەکەوێتە نێوانی (500)ساڵ دوای لەدایکبوونی مەسیح تا ساڵانی 1400 (6). بەلام بیری کۆنتراکت لە کۆتایی ساڵانی (1500)دا بە کێشێکی قورسترەوە دەرکەوت. چونکە ئەو کاتە لە خەباتی سیاسیدا دژی دەسەلاتی موتڵەقی پادشا بەکار دەهێنرا. بەکارهێنەرەکانیش هۆجینۆتەکان بوون، ئەو پرۆتستانتە فەرەنسیانەی سەر بە لێکدانەوەی "زوینگلیس" و "کالڤین" کە دەسەلاتی پادشای کاتۆلیک ڕێگای ئاینەکەی لێ گرتبوون (13/1).
لە ساڵانی (1570) دا چەند پارچە نوسراوێکی بێ ناونیشان بلاوکرایەوە کە تیایاندا مەسەلەی هۆجینۆتەکان لە تێرمی پەیمانی کۆمەڵگادا بلاوکرابۆوە. بەناوبانگترینیان ئەم پارچەیە بوو: **"داوای ماف دژی زۆردار"** کە لە ساڵی (1579)دا بوو. ئەو کاتە دەسەلاتی پادشا بۆ بەرپێچیلێکردن نەبوو. بڕیاری هەرچیەکی بدایەو هەرچی بکردایە بەرهەڵستیی لێ نەدەکرا. هۆکارەکەشی ئەوە بوو کە پادشا دەسەلاتی ڕاستەوخۆ لای خواوە بۆ دێت. لە "داوای ماف دژی زۆردار" دا، داوای ئەوە کرا بوو کە لە جیاتی ئەوەی پادشا پەیوەندی ڕاستەوخۆی بە خواوە بێت، پێویستە کۆنتراکتێک لە نێوان ئەو و خەڵکدا هەبێت. کۆنتراکتێک کە هەر کاتێک پادشا سەرپێچیی لە پەیامی خوا کرد یاخود خەڵکی چەوسانەوە، بتوانرێت لاببرێت. سڤێن نوفە دەڵێت: "*ئەمە بۆ کاتی خۆی بە پەیامێکی سیاسی شۆڕشگێڕانە لە قەڵەم دەدرا*" (14/1). بەلام هەرچەندە ئێمەش لە ساڵی 1998داین، کەچی ئەوەی لەناو فەرەنسیەکاندا (418) ساڵ



لەمەوبەر پەیامێکی سیاسیی شۆڕشگێڕ بووە، بۆئێمە هێشتا نەهاتۆتە کایەوە. چونکە وەکو لە ژمارەی پێشوودا باسم کرد، کورد میللەتێکی بێ کۆنتراکتە، مێژووەکەی مێژوویەکی بێ مەرجەو سەرکردەکانی تا ئەمڕۆ بۆ لابردن نین. جگە لەوەش تازە بۆ ساڵی (2000)، پاش هەزاران قوربانی و کارەسات و ڕووداوی گەورەی وەکو هەڵەبجەو ئەنفال و ڕاپەڕین، سیستێمێکی دەسەڵاتی وا لە حیزبەکانی باشور دروست دەبێت کە سەرۆکی یەکێک لە هێزەکانی (مەسعود بارزانی) بۆ ئەوەی لە قودسیەتی کەم نەبێتەوە نەچێتە ناو پەڕلەمانێکەوە کە زۆربەی دانیشتوانی ژێر دەسەڵاتیان بە شانازیەوە دەنگیان بۆ داوە.

ئایدیای کۆنتراکت لە نێوانی دەسەڵاتدارو خەڵکدا لەلایەن هەروەها نووسەرە کاتۆلیکەکانیشەوە بەرزکرایەوە. **خووان دێ ماریانا** (1537- 1624)، کە یەکێک دەبێت لە کاتۆلیکە سەربازییە ئیسپانیەکان، بەڕای سڤێن ئوڤە هانسۆن، هەنگاوێک زیاتر لەوەی کۆن دەڕوات، بەوەی کە زیاد لە (364) ساڵ لەمەوبەر دەڵێت ئەگەر پادشا لەسەر کۆنتراکتەکەی نێوان خۆی و خەڵک نەڕۆشت وەکو تاکە ڕێگا دەتوانرێت بشکوژرێت.

ساڵی (1651) فەیلەسوفی ئینگلیزیی **تۆماس هۆبس** کتێبێکی بە ناوی (Leviathan) واتە دەسەڵاتدار، دەرکرد. لەو کتێبەدا قوڵتر و فەلسەفی تر لەوانەی پێشوو تیۆری کۆنتراکتی خستە ڕوو. **سڤێن ئوڤە** دەڵێت هۆبس لە باری سیاسیەوە تێگەشتنەکەی ڕێک قڵپ کردەوە. تا ئەو کاتە تیۆری کۆنتراکت بەکار دەهات بۆ دژایەتیکردنی دەسەڵاتی بێ سنوری پادشا. بەڵام ئەو بە پێچەوانەی زۆربەی تیۆرکارەکانی کۆنتراکتەوە، تیۆرەکەی بەکار هێنا بۆ داکۆکی کردن لە دەسەڵاتی موتڵەقی پادشاو ڕای وابوو کە پەیمانی کۆمەڵگا کاتێک هاتە کایەوە خەڵک بە شێوەیەکی موتڵەق بەندە پێرەوی. ئەمەش بە پێچەوانەی "**جۆن لۆک**"ەوە کە ڕای وابووە خەڵک بە کۆنتراکتەوە نەبەستراوەتەوە ئەگەر پادشا لێی لادا. ئەم بۆچوونەی جۆن لۆک بۆ تیۆری کۆنتراکت توانرا لە کیانی شۆڕشی فەرەنسیدا، وەکو سەلماندنێک بۆ گۆڕینی کۆمەڵایەتیی، بەکار بهێنرێت. بە پێی سڤێن کاتێک پەیوەندی پادشا و خەڵک لەسەر ئەو بناغەیە وەستایەوە کە پادشا لە کۆنتراکتەکەی لای داوە، ئیتر مانای وابوو کە کۆنتراکتەکە دەبوو بگۆڕرێت یان ڕاستر هەڵوەشێنرێتەوە، کە ئەنجامەکەی داگرتنی پادشا بوو (7/ 64). بەڵام ئایا هۆبس کە تیۆری کۆنتراکتی قڵپ کردەوە بۆ داکۆکیی لە دەسەڵاتی موتڵەقی پادشا، دەتوانێت پاساوی دەسەڵاتی سەرکردەی حیزبەکانی باشووری کوردستان بداتەوە؟

هۆبس لە مێژووی فەلسەفەی سیاسیدا سەرچاوەی قەریحەی زۆربەی بیرکارە کۆنیاریزەکان بووە. لای وابووە دەسەڵات بۆ بەشکردن نابێت. دەسەڵات باشتر وایە لە دەستی سەردارێکدا بێت، ئەگەر نا لە دەستی دەستەیەکدا کۆبێتەوەو لەگەڵ بۆ نموونە پەڕلەماندا بەش نەکرێت. بۆچوونەکانی دەربارەی ئازادیی بەجۆرێکە کە سڤێن ئوڤە دەڵێت ئەم جۆرە بیرکردنەوەیە بۆ بیرکردنەوەیەکی مۆدێرن دەربارەی "ئازادیی" ئەوەندە نامۆیە کە هەست تاکەم بەرپەچدانەوەیەکیان قەرزاری خوێنەر بم (86/7). هەروەها **هانتو تاپانی** دەربارەی ڕای هۆبس لەسەر "ماف" دەڵێت فەلسەفەی هۆبس زیاتر بەسەر ژمارەیەک گورگدا دەسەلمێت کە دوای مارەیەک گەڕان لە شوێنێکدا کۆبنەوەو بۆ ئەوەی یەکتریی نەخۆن گەلە گورگێک پێک بهێنن و یەکێک لە خۆیان بکەن بە سەرۆکێکی سەردار (76/4). دەسەڵاتدارەکانی کورد لە ساڵی (2000)یشدا ئەو فەیلەسوفەش (واتە هۆبس) نایان گرێتەوە کە پارێزگاریی لە دەسەڵاتی موتڵەقی پادشا کردووە. ئیندیڤیدوالیزمی سیاسی بە بەربڵاویی یەکەم جار لە سالانی (1600)دا هاتە کایەوە. لای **تۆماس هۆبس و جۆن لۆک** و ژمارەیەکی زۆری تر بیری ئەوە هاتە پێشەوە کە ئەرکی سەرشانی حکومەتە بەرژەوەندی تاکە کەس بپارێزێت. هۆبس و لۆک وەکو زۆربەی نووسەرەکانی سالانی 1700 دوو کەس بوون لەوانەی کە لایان وابووە حکومەت دەبێت تا ڕادەیەکی زۆر لە سەر بناغەی ڕەزامەندیی ئەندامەکانی دروست ببێت. بە پێی **سڤێن ئێریک** نوسەرە سیاسیەکان هەر چۆنێک جیاواز لەو ئایدیایە دوابێتن بەڵام ئەوەیان دەرخستووە کە: حکومەتێک بۆ ئەوەی لەسەرەوە ئیشی خۆی بکات دەبێت کاربەدەستانی خۆی و تاکەکانی ژێر دەسەڵاتی دڵنیا بکات لە چەند دەسکەوتێکی دیار کە مرۆڤەکان نەتوانن لە دەرەوەی دەسەڵاتی ئەو حکومەتە پەیدای بکەن (115/3).

کەواتە بە پێی ئەو تێگەشتنە بۆ ئەوەی لە ڕووی سیاسیەوە بەو دامودەزگایەی کە سیستێمی دەسەڵاتی حیزبەکان دروستیان کردووە بوترێت "حکومەت"، دەبێت هەندێک دەسکەوتی بینراویان هەبێت بۆ ئەو خەڵکەی ژێر دەسەڵاتی ئەوان کە کاتێک حکومەتەکە نەما ئەو دەسکەوتانەیان لەدەست بچێت. ئنجا لێرەدا ئەو پرسیارە دێتە پێشەوە کە ئایا خەڵکی کوردستان لەژێر دەسەڵاتی سیستێمی حیزبەکاندا چیان دەست کەوتووە یان چیان بۆ دابین کراوە کە ئەگەر ئەم حکومەتە نەما خەڵکەکە لەکیسیان بچێت؟ منیش لەبەردەمی ئەم پرسیارەدا خۆم بە قەرزاری خوێنەر نازانم بیسەلمێنم هیچ.

## دەسەڵاتی سیاسی و دەسەڵاتی دژکار

کۆمەڵگا لە بنەڕەتدا لە ڕێگای کۆنتراکتێکەوە دروست بووە. ئەم کۆنتراکتە کۆنتراکتێکی نەنوسراوەیەو پێویستیی ژیان هێناویەتە کایەوە. کۆنتراکت لەسەر مەرج دامەزراوە. هەر کاتێک مەرج نەما کۆنتراکت نامێنێت. مرۆڤێک لە بنەمایەکی سروشتییەوە (واتە بێ ئاگاش بێت لێی یان گفتوگۆشی لەسەر نەکردبێت) بە مەرجێک لە کۆمەڵەیەکدایە کە ئەو دەسەڵاتەی لێی دروست بووە هەم بی پارێزێت لە ئەندامانی گروپەکە خۆی و هەم لە هەڕەشەی دەرەوە. هەر کاتێک ئەم مەرجانە نەما، هەر یەکێکی بەهێزتر بێت وماڵی یەکێکی بێ دەسەڵاتر زەوت بکات، یان هێزێک نەبوو لە بەرامبەر هەڕەشەی دەرەوەدا ئەندامەکانی بپارێزێت، هەڵوەشان دروست دەبێت. ئەمە ئیتر ئەو بارەیە کە مرۆڤ لە سەرەتادا بۆ بەردەوامبوون لە کۆنتراکتێکدا کۆمەڵگای لێ دروست کردووە. لێرەدا لە تیۆرێک ئەو بەشە دەخەمە ڕوو کە پەیوەندیی بەم باسەوە هەیە.

تیۆری **دوباڵیی دەسەڵات:**

هەموو دەسەڵاتێک دوو باڵی هەیە. یەکەم باڵی ناوەوە، دووەم باڵی



**وێنە کۆمەڵێک لاوی کورد کە لە لایەن حکومەتی عێراقەوە، بێ باکانە، لە بەرچاوی جەماوەرەکە گوللەباران دەکرێن.**

> **هێزە دژکارەکان جگە لەوەی کە خۆیان دەست درێژکەرن بۆ ئەندامەکانی خۆیان، دڵنیاییش بۆ هێزی بێگانە، کە کورد کوشتن لە سەریان نەکەوێت**

دەرەوە.

ا- **دەسەڵاتی سیاسی**: ئەو دەسەڵاتەیە کە باڵی ناوەوەی باڵی ڕێکخستن و بەڕێوەبردنی کۆمەڵەکەیەتی و باڵی دەرەوەی باڵی پارێزگاریی خەڵکەکەیەتی لە سەر خاکی خۆی لە مەترسیی دەرەوە.
هەموو دەسەڵاتێک بۆ ئەوەی پێی بوترێت دەسەڵاتێکی سیاسی دەبێت لایەنی کەمی ئەو مەرجانەی تیا بێت. هەر دەسەڵاتێک ئەو مەرجانەی تیا نەبوو ڕەوایی سیاسی نیە.

ب-**دەسەڵاتی دژکار**: ئەو دەسەڵاتەیە کە باڵی ناوەوەی باڵی تێکدانی ڕەوتی ئاسایی و بۆدواوەبردنی کۆمەڵەکەیەتی و باڵی دەرەوەی باڵی دەست لێبەردان و فەوتاندنی کەسەکانێتی لە بەردەمی مەترسیی دەرەوەدا.
هەر دەسەڵاتێک ئەو مەرجانەی تیا بوو لە دەرەوەی نەخشەی سیاسەتە. ئەم دەسەڵاتە بۆ ئەوە نیە گفتۆگۆی لەسەر بکرێت چی بکات، بۆ ئەوەیە لاببرێت.

ئایا بە پێی ئەم تیۆرە دەسەڵاتی ئەو سیستێمەی ژمارەیەک پارت و هێز لە باشووری کوردستاندا دروستیان کردووە دەسەڵاتێکی سیاسیە یان دژکار؟ لەم نموونانەی خوارەوە ورد ببەرەوە!

لەسەر ئاستی باڵی ناوەوە: سەدی بەخەو کارگەو تراکتۆرو شۆفڵ، کە سامانێکی میللین و ئامێری ئاوەدانکردنەوەو بوژانەوەی ئابوریین، ئەودیو دەکەن و دەیان فرۆشن بۆ خۆیان، گرووپی قاچاخچێتی و بازرگانیی مافیائاسا دروست دەکەن کە دژکاری ئابورییەکی ئاساییە و ئەنجامەکەی ناهەمواریی دەخاتەوە، لەسەر خراپەکاریی ناویان دەچێتە ڕاپۆرتی ئەمنستییەوە، ماڵی خەڵکیی داگیر دەکەن. **"ئێریک فاڵت"**ی قسەکەری نەتەوە یەککگرتووەکان لە ڕۆژی ٤ی مانگی یانزەی پار، بە ڕۆیتەر دەڵێت: "*سەرەرای گەرمنتی سەرۆکی "یەکێتی" و "پارتی"، بەڵگەمان بەدەستەوەیە کە لەم دوو هەفتەیەی دوایدا 1000 کەس لە شوێنی خۆیان ڕاگوێزراوون و دابەشکردنی ئازووقەو داودەرمان لە ناوچەکەدا بەو هۆیەوە گران بووە*". هەروەها ناوبراو دەڵێت "*ئەم سیاسەتی ڕاگوێزانە وەکو سیاسەتی پاککردنەوە وایەو بە زۆری ژن و مناڵ و پیری تیا دەچێت*" (19/9). لە کاتێکدا مناڵەکورد لەناو تەنەکەی خۆڵدا دەگەڕێت بۆ پارچە نانێک دەسەڵاتدارەکان مەسبەح لە ماڵەکانیاندا دروست دەکەن و بانقەکانی دەرەودیان بە دۆلار دەئاخنن. لە کاتێکدا منالان لە قوتابخانە کورسی نیە لەسەری دابنیشن، قوربانیەکانی هەڵەبجە پارەیان پێ نیە بچن بۆ لای دوکتۆر، ئەوان ملوێنەها دینار سەرف دەکەن لە شەڕی یەکترکوشتن و وێرانکردنی ژیانی خەڵک و کۆمەڵگادا.

لەسەر ئاستی باڵی دەرەوە: واتە کە دەسەڵاتێک دەسبەرداری ئەندامەکانی بێت و بیان خاتە بەردەمی مەترسیی دەرەوە، نموونە زۆرە لەوانە؛ تەماشای ئەو وتارە بکە کە **عومەر نوری قادر** لەم ژمارەیەدا نووسیویەتی. ئەم وتارە ئەوە پیشان دەدات کە چۆن ژمارەیەک لاوی کورد لە باڵی ناوەوەی دەسەڵات هەڵدێن و باڵی دەرەوەشی چۆن دەسبەرداریانە. نمونەی کۆچ و خنکان و کوژراتی ڕێگای کوردستان جێهێشتن و ئاوارەبوونی بابەتی وەکو کوردەکانی پاکستان، پیشانی دەدەن کە ئەم دەسەڵاتە دوورە لەوەوە لەسەر مێزی سیاسەت باس بکرێت. دەربارەی ئەو خاڵەش کە دەسەڵاتی دژکار خەڵکەکەی بخاتە بەردەمی مەترسیی دەرەوە، ئەمانە نموونەن؛ شەڕی ناوخۆ کە شەڕی وڵاتانی بێگانەیە لە سەر خاکی کوردستان و بە کورد خۆشی دەکرێت، هێنانەوەی سوپای سەددام حوسەین، لەپێش سوپای تورکییەوە ڕۆشتن، هێنانی سوپای ئێران بۆ سەر کۆیە، هێنانی دەزگا جاسوسیەکانی وڵاتان بۆ کوردستان و تیرۆرکردنی کوردی ڕۆژهەڵات. لە کاتێکدا لەژێر دەسەڵاتی **یاسر عەرەفات**دا کە لە ڕێککەوتندان لەگەڵ ئیسرائیل، مناڵەفەلەستینیی بەرد دەگرێتە هێزەکانی ئیسرائیل و ئاڵاکەیان دەسوتێنن، لە کوردستان، لەژێر دەسەڵاتی سیستێمی حیزبەکاندا مناڵەکورد دەبێت هەر جارەو بەپیر سوپای داگیرکەرێکەوە بچێت. سروشتی ئەو نمونانەی سەرەوە بە جۆرێکن، کە گفتوگۆکە دەخەنە فەقەرەی دووەمی تیۆرەکەوە. نمونەکان ئەوە پیشان نادەن کە دەسەڵاتی حیزبەکان بە کام شێوە سیاسین، بەڵکو ئەوە دەگەیەنن کە بە چ شێوەیەک دەسەڵاتێکی دژکارن. بە واتایەکی تر، لەوە دەرچووە باسەکە ئەوە بێت کە دەتوانرێت کۆمەڵگاکە لەوە باشتر بەڕێوە بچێت و میللەتەکەش لەوە زیاتر لە مەترسیی دەرەوە دەپارێزرێت.

**ئەو دەسەڵاتەی کە سیستێمی حیزبەکان ئێستا لە باشووری کوردستاندا پێکیان هێناوە، نەک**

**لەبەرژەوەندیی مرۆڤی کورد نیەو لە مەترسی ناپارێزێت، بەڵکو خۆی هەڕەشەیەکی گەورەیە کە خەڵکی کورد دەبێت بۆ مانەوەی خۆی بەزوترین کات خۆی لە کۆنتراکتێکدا ڕێک بخاتەوە.**

هۆی ئەو هەڕەشەیەش هەڵەیەکی فیکریی نیە، پەیوەندیی بە زانین و نەزانینەوە نیە، نەبەستراوە بە جامانەو بۆینباخەوە، بەڵکو لە بنەڕەتدا دەگەڕێتەوە بۆ سروشتی حیزب و هێزەکان کە تەنها بە فۆرم کوردن، دەنا لە ناوەڕۆکدا بەشێکن لە سیاسەتی وڵاتانی دەرەوە.

## سەرکردەکانی باشووری کوردستان، زۆرداریش نین

ئەو زاڵم و زۆردارانەی کە میللەتان بە حوکمیان ڕازی نەبوون و هەستاوون لە دژیان، ئەوانە نەبوون سوپای بێگانەیان هێنابێتە سەر نیشتیمانی خۆیان. هێزێک بووە ئەگەر خاکی خەڵکی تریشی داگیر نەکردبێت، ئەوا پارێزگاریی خاک رخەڵکەکەی خۆی لە هێزی دەرەوە کردووە. جۆن ستیوارد میل دەڵێت: " *بۆ ئەوەی ڕێ لەوە بگیرێت ئەندامێکی لاوازتری کۆمەڵەکە ببێت بە نێچیری کۆمەڵێکی لە ژمارەنەهاتوو، پێویستە داڵێک لە هەموو داڵەکان بەهێزتر بێت بۆئەوەی دەست بەسەر هەموویاندا بگرێت. بەڵام لەبەرئەوەی ئەم داڵەپادشایە پۆلەکەش وەکو داڵە بچکۆلەکانی تر دەدات بە زەویدا، ئەوا دەبێت هەمیشە وەکو مەرجێکی ناچاریی پیاو خۆی لە چنگ و دەنوکی ئەم داڵەش بپارێزێت. خەباتی تێکۆشەران ئەوە بووە کە سنوورێک دانێن بۆ دەسەڵاتی حوکمی ئەم سەردارە بەسەر کۆمەڵەکەدا و، بۆئەوان ئەم سنووردانانە بووە مانای ئازادیی.*

هەروەها بە پێی جۆن میل تا مرۆڤایەتیی بەوە ڕازی بووە کەم و زۆر گەرەنتی ئەوەی هەبێت کە بە یارمەتی دوژمنێک دژی دوژمنێکی تر بجەنگێت و لە لایەن سەردارێکەوە بەڕێوە ببرێت، هەوڵەکانی دژی زۆرداریی لەو سنوورە نەچوونەتە دەرەوە. بەڵام وەختێک لە پێشکەوتنی مرۆڤایەتیدا هاتە پێشەوە کە ئیتر پێویستیەکی سروشتیی نیە ئەوانەی حوکم دەکەن دەسەڵاتێکی بێ سنووریان هەبێت کە پێچەوانەی بەرژەوەندیی حوکمکراوان بێت، وا بیر کرایەوە کە کاربەدەستانی حکومەت نوێنەر یان نێردراوی خەڵکەکە بن کە بە ویستی خەڵکەکەش بتوانرێت لا ببرێن. تەنها بەم شێوەیە مرۆڤ لای رابووە کە دەتوانرێت لە سەتا سەت گەرەنتی ئەوە بکرێت کە دەسەڵاتی حکومەت بەکار نەهێنرێت بۆ خراپەی خەڵک (10/9)

بە پێی **ڕۆڵف ئێڤەگۆرد**، ئەو داواکاریانەی لە "دەسەڵاتی دیموکراتی" دەکرێت زۆر جار ئەوانەن کە دیکتاتۆری پێ ناسراوە: دەسەڵاتی حکومەتێکی بە هێز. حکومەتێکی دیموکراتی بەهێز (کە زۆر جار لەسەر ئابووریەکی تەندروستوەستاوە) بۆئەوەی:
١-توانای ڕاگرتنی ڕێکخستنی دیموکراتی هەبێت. ٢-دانیشتوان لە تاوانکاریی بپارێزێت. ٣-ئەوانە سزا بدات کە لە یاسا لا دەدەن. ٤-ڕێ لە ناکۆکیی نێوان گروپە جیاوازەکانی وڵاتەکە بگرێت و جیاوازیی ئاستی ژیانی گروپەجیاوازەکان کەم بکاتەوە. ڕۆڵف کە نازییەکان بە خراپترین دیکتاتۆری مۆدێرن ناو دەبات، دەڵێت ئەڵمانیا مەرجی حکومەتێکی بەهێزو تا ڕادەیەکی زۆریش ئەو چوار مەرجەی تری پڕ کردەوە. کاتێک نازییەکان دەسەڵاتیان گرتە دەست حکومەت بەتەواوی کۆنترۆڵی وڵاتەکەی لە دەست دا بوو. تەنها ئەوە نەبوو کە بێئیش ئەوەندە زۆر بوو کە ئیتر تۆمار نەدەکرا، پارەش ئەوەندە بێ نرخ بوو بوو کە ئەوانەی موچەیان وەر دەگرت دەبوو لە ڕۆژێکدا دوو جار وەری گرن. نرخی پولێکی پۆست بە ملیارد مارک بوو. لە مانگی (١١)ی ١٩٢٣دا نرخی دۆلاری ئەمەریکیی بوو بە (5000 000 000 000) مارکی ئەڵمانیی. لە ساڵی (١٩١٨)ەوە تا ساڵی ١٩٢٣ ئەڵمانیا ١٧ حکومەتی جیاوازی هەبوو. لە دوای ساڵی (١٩٣٣)ەوە کە هێتلەر هاتە سەر حوکم، بە چوار ساڵ ئەو بارە ئابوورییە ناهەموارەی هەبوو بە ئابوورییەکی پتەو جێگای پێ گیرایەوەو ئەڵمانیا وای لێهات کە پێویستی بە هێزی کار هەبێت (10).

مەسەلەکە لە بواری سیاسیدا کێشەی وەکو ئازادیی و یەکسانیە کە حوکمی زۆردارو دیکتاتۆر دەگۆڕێت بە حوکمی سیستێمێکی تر، لەوانە دیموکراتی. ئەمانەی زۆربەی خەڵکی کورد بە سەرکردەو تێکۆشەر ناویان دەبەن، لە ڕوانگەی سیاسیەوە زۆرداریش نین، دەسەڵاتی دژکار بۆئەوە نابێت ئیجرائات بکات، هی ئەوەیە


ڕێنەی جاشی کورد، کاتی گرتنەوەی شاری هەولێر، 31-8-96


فۆتۆ: فەواز نورەدین. DN. فەلەستینیی، ئاڵای ئیسرائیل و بوکەشوشەی سەروک وەزیرانەکەی لە گەزە دەسوتێنن. ئەمە لە کاتێکدا کە لە گفتوگۆشدان.

ئیجراناتی لەگەڵ بکرێت. ئەو نوسەرو هۆنەرانەش کە لە دەرباری ئەم دەسەڵاتەدا دەفکرن و ژان دەیان گرێت، بۆ ئەوە نابن داوای هەڵوێستیان لێ بکرێت، خۆیان هی ئەوەن هەڵوێستیان لێ بگیرێت.

**سەرچاوەکان**


1-Sven Ove Hansson, Ideer Om Rättvisa.

2-Jean Jacques Rousseau, Om Samhällsfördraget, Natur o Kultur.

3-Sven-Eric Liedman, Från Platon Till Kommunismens Fall.

4-Hannu Tapani Klami, Sanningen Om Rätten.

5-Einar Eriksson, Klassisk Demokrati Teori.

6-National Encykopedin3,13.

7-Sven Ove Hansson, Om Frihet, Jämlikhet, Broderskap!

8- مێمن: کۆنتراکت، ژ 1، ل 4.

9-Jon Sturat Mill, Om Friheten, N.o.K.

10-Rolf Ejvegård, Värld Och Vetande,Nr:5-6 1992.


# مافی مرۆڤ لەعێراقدا: تێبینییەک لەلایەن سکرتێری گشتییەوە

لەمانگی (10)ی ساڵی (1997)دا، سکرتێری گشتیی نەتەوە یەکگرتووەکان راپۆرتێکی (A/52/476) کورتی دەربارەی مافی مرۆڤ لەعێراقدا خستە بەردەستی ئەندامانی کۆمەڵەی گشتیی. ئەو راپۆرتە لەلایەن ماکس ڤان دەر ستۆول (Max van der Stoel)ەوە ئامادەکراوە. ڤان دەر ستۆول راپۆرتنێری تایبەتییە لە کۆمیتەی مافی مرۆڤ لەنەتەوە یەکگرتووەکان. بەپێی ئەو راپۆرتە، پێشێلکردنی مافی مرۆڤ لەلایەن حکومەتی عێراقییەوە ئێجگار زیادی کردووە.

بەپێی راپۆرتی ژمارە (S/1997/685)ی سکرتێری گشتیی، زیاتر لە (500,000) کەس لەسێ پارێزگاکەی سەرووی عێراق (دهۆک، سلێمانی وهەولێر) بەزۆر راگوێزراون. نیوەی ئەو ژمارەیە لەپێش ساڵی (1991)دا راگوێزراون، (100) هەزار کەسیان لە نێوان ساڵانی (1991)و (1995)، (150) هەزاریشیان لە ساڵی (1996)دا راگوێزراون. زیاتر لە (3000) کەسیش لەساڵی (1997)دا لەماڵوحاڵی خۆیان دەرکراون.

ئێستا، راگواستنی زۆرەملیی کوردەکان وتورکمانەکان لەچوارچێوەی سیاسەتێکدا پیادەدەکرێت کە مەبەستی گۆڕینی نەخشەی دیمۆگرافی ناوچە نەوتییەکانی کەرکوک و خانەقینە. هەرچەندە ئەم سیاسەتە تازە نییە، بەڵام لەساڵی (1997)دا ئەم راگواستنە زۆرەملییانە زۆرتر بووە. بۆ ئەوەی ژمارەی عەرەب لەناوچە کوردییە نەوتییەکاندا زیادبکات، حکومەتی عێراقی، هێندێک لەناوچەکانی کەرکوک و دەوروبەرەکەی بەتەواوەتی لە کوردەکان چۆڵ کردووە. بەپێی ئەو راپۆرتە، کەلوپەلو ماڵی ئەو کوردە راگێزراوانە دەدرێن بەو عەرەبانەی کە لەجێیان نیشتەجێ دەکرێن. زوربەی راگێزراوەکان دەڵێن کە تەنیا هەفتەیەک مۆڵەتیان پێ دراوە بۆ گواستنەوەو هەڕەشەیان لێکراوە کە ئەگەر سەرپێچیی بکەن سزا دەدرێنو بەند دەکرێن. ئەو راگوێزراوانە بۆیان هەیە بچن بۆ شارەکانی سەروو (دهۆک، سلێمانی و هەولێر) یان خوارووی عێراق. ئەگەر بیانەوێت بچن بۆ شارەکانی سەروو (بۆ نموونە شاری سلێمانی کە خزم و کەسوکاریانی لێیە)، ئەوا رێیان نادرێت هیچ شتێک لەگەڵ خۆیان ببەن.

لە (13)ی مانگی پێنجی ساڵی (1997)دا، دامودەزگای عێراقیی فەرمانی راگواستنی (1300) خێزانی کوردو تورکمانی لە کەرکوک دەرکرد. لە (20)ی هەمان مانگدا، (37) لەو خێزانانە گەیشتنە چەمچەماڵ. لەمانگی (8)ی ساڵی (1997)دا، دامودەزگای عێراقیی بە (440) خێزانی کوردی شارۆچکەی جەلەولاو قەرەتەپەی سەر بە خانەقینیان راگەیاند کە دەبێت بگوێزنەوە بۆ خوارووی عێراق وەیان بۆ ئەو ناوچەیەی کە کەوتۆتە ژێر دەسەڵاتی "حکومەتی هەرێمی کوردستان"ەوە لەشاری کەرکوک سەربازەعێراقییەکان بەبەردەوامی هەموو رۆژێک (هێندێک جار بەیانیان زوو یان ئێواران درەنگ) ماڵەکان دەگەڕێن. هێندێک جار، گەڕەکێک تەواوی رۆژەکە دادەخرێت و کەس بۆی نییە ماڵی خۆی جێبهێڵێت. بیانووی ئەم ماڵپشکنینانە گوایە گرتنی ئەوکەسانەیە کە لەسەربازیی رایانکردووە. بەڵام لەراستیدا، مەبەستی سەرەکی ئەم کارە بێزارکردنی خەڵکەکەیە بۆئەوەی بگوێزنەوە. بەگوێرەی وتارێکی رۆژنامەی (الشرق الاوسط)ی (2)ی مانگی چوار، (1500) کەس لە خانەقین و (80) خێزان لە کەرکوک بەزۆر راگوێزراون. هێندێک لەئافرەتەکان لێدرابوون و ئیهانەکرابوون. ژمارەیەک لەپیاوەکانیش بەندکرابوون چونکە ئامادەنەبوون ماڵەکانیان چۆڵ بکەن. ئەو ماڵانە بۆ خواروو و رۆژئاوای عێراق نێردرابوون چونکە رێگایان نەدرابوو بچن بۆ سەرووی عێراق. بەپێی ئەو هەواڵانەی کە بە نوێنەری نەتەوەدیەکگرتووەکان گەیشتبوو، ئەم خێزانە راگێزراوانە نەیانتوانیبوو شوێنێک بدۆزنەوە بۆ ئەوەی لێی بژین، بۆیە بەناچاریی چوبوونە مزگەوتەکان لەدێی (الیوسفیە)و (المحمودیە)ی خوارووی بەغداو ناوچەی (مسیب)ی پارێزگای بابیلۆن.

راپۆرتەکە هەشت پێشنیار پێشکەش دەکات بە کۆمەڵەی گشتیی و کۆمیتەی مافی مرۆڤ بۆ ئەوەی عێراق ناچاربکرێت رێز لەمافی مرۆڤ بگرێت. بەڵام ئایا ئەو رێکخراوە نێونەتەوەییەی کە کورد هیچ نوێنەرێکی تیایدا نییە، هێندێک لە ئەندامە خاوەن ڤیتۆکانی (روسیا، چین و فەرەنسا) بەئاشکرا لایەنی عێراق دەگرن، وزوربەی ئەندامەکانی دیکەشی لەبەر بەرژەوەندی ئابووریی نایانەوێت پەیوەندیان لەگەڵ عێراق تێک بچێت، دەتوانێت حکومەتی عێراقیی ناچاربکات کە دەست لەو کارانە هەڵگرێت؟ وەڵامی ئەو پرسیارە لەو راستییەدایە کە کورد هەتا لەدەرەوەی بڕیارەکان بمێنێتەوەو مەسەلەکەی بەدەست ئەو رێکخراوو دەوڵەتانەوە بێت کە بۆ بەرژەوەندیی خۆیان بەکاری دەهێنن، ئەوا نەک هەر رژێمی عێراقی و ئێرانی و تورکی و سووریی ناچارناکرێن دەست لەو کارانە هەڵگرن، بەڵکو زیاتر لەجاران مافی مرۆڤی کوردو مەسەلەکی پێشێلدەکەن.

# دادگایەکی نەتەوەیی و قانونێک



**مەسەلە سەرکردەکان نیە چی بکەن،**
**ئێمەین چۆن لەبەردەم دادگایەکدا ڕایان گرین.**

سەروەر

ڕووداوەکانی دەرەوەی وڵات لەگەڵ ڕووداوەکانی کوردستان دا لێکچونیان هەیە، بەڵام چارەسەر و ئەنجامەکانیان جیاوازن. لێپرسراوی ئەو حیزبانەی کە خراپە دەپارێزن دەڵێن "لە وڵاتانی دیکەش دز هەیەو دزیش دەکرێ". ئەمە ڕاستە، بەڵام جیاوازییەکەی ئەوەیە کاتێک کەسێک بە دزییەوە دەگیرێت مۆڵەتدانی حیزبێکی لە گیرفاندا نییە. کاتێک لێپرسراوی حیزبێک ماڵی میللەت بۆ خۆی دەبات سکەنداڵێک بۆ حیزبەکەی و دادگایەکیش بۆ خۆی دروست دەکات. ئەو کەسەی ئەمنییەت و سەربەخۆیی وڵاتێک دەفرۆشێت بە خیانەت کار دادەنرێت نەک بە پاڵەوانی مەیدان. لەناو نەتەوەکانی دیکەدا هیچ سەرێک پیرۆز نییە ئەگەر لە خزمەتی نەتەوە و وڵاتدا نەبێت. کوردیش دەبێت ئەو سەرانە دادگایی بکات کە لە خزمەتی بێگانەدان. ڕووداوەکانی دەرەوەی وڵات بە خەڵکی کورد نامۆنین، بەڵام کورد چییان لێوە فێردەبێت؟

## ئینگلتەرە

پادشای ئینگلتەرە، چارلس( Charles )، بۆ دامرکاندنەوەی ڕاپەڕینەکانی ناوخۆ داوای یارمەتی لە ئیرلەند و فەرەنسا کرد. پەرلەمانی ئینگلتەرە بڕیاری گرتن و دادگایی کردنی پادشایان دا. دادگای پەرلەمان لەسەر چەند تاوانێک بڕیاری کوشتنی چارلسی دەرکرد. لەو تاوانانە:

- پەیوەندی کردن بە هێزی بێگانە و دوژمنەوە بۆ دامرکاندنەوەی ڕاپەڕینەکانی ناوخۆ.
- خیانەتکردن لە ڕێبازی دینی پرۆتیستانتی.
- بەکارهێنانی ماڵ و دارایی دەوڵەت بۆ مەبەستی شەخسی.

لە ڕۆژی 1649/1/30 دا بە سەرپەڕاندن بڕیاری کوشتنەکەی پادشا جێبەجێ کرا (1).

## سوید

سەرۆک وەزیرانی سوید یۆران پێرشۆن ( G. ran Persson )، لە ڕۆژی 1996/11/6 دا دەعوەتی سەرۆک کۆماری چین دەکات بۆ سوید. لە هەمان ڕۆژدا، لە کۆبونەوەیەکی ڕۆژنامە نوسیدا لە چین، کە وڵاتێکی دیکتاتۆرە و مافی مرۆڤ پێشێل دەکات، دەڵێت "سەقامگیری سیاسی بۆ ئەو پێشکەوتن و گەشەکردنە ئابوورییەی کە لە چیندا هەیە گرنگە".

ئەم وتەیەی پێرشۆن لە دەزگای ڕاگەیاندنەکانی چیندا بە پڕوپاگەندەیەکی پۆزەتیڤ بۆ ڕژێمی چین بەکارهێنرابوو.

پێرشۆن لە سەر قسەکەی ودەعوەتەکەی لە ڕۆژی 11/7 دا دەدرێت بە بەشی "دادگای" پەرلەمان ( KU ). لەبەرئەوەی دەعوەتی سەرۆک کۆماری وڵاتێک دەبێت ئەو کۆمیتەیەی کە هەموو حیزبەکان تێیدا بەشدارن لە وەزارەتی دەرەوە بڕیاری لەسەر بدات. ئەم کۆمیتەیە داوایان کرد دوای گەڕانەوەی پێرشۆن لە چین بێت لەبەردەمی کۆمیتەکەدا ڕونی بکاتەوە، کە لە سەفەرەکەیدا چی گوتووە و مەبەستی لە گرنگی "سەقامگیری سیاسی" چی بووە (2).



کاریکاتێرێک لە سەر یۆران پێرشۆن

سەرۆک وەزیران پاش گەڕاندنەوەی لە بەردەمی کۆمیتەکەدا لە وەزارەتی دەرەوە پاشگەز بۆوە و داوای لێبوردنی کرد کە بە بێ پرسی کۆمیتەکە دەعوەتی سەرۆککۆماری چینی کردووە.

سەرۆکی پارتی ژینگە، بیریەر شلاوگ ( Birger Schlaug )، لەسەر قسەکەی پێرشۆن کە لە چین کردبوی ئەمەی پێدەڵێت "لەڕاستیدا ئەو فێری یەک شت نەبووە. لەبەر ئەوە ناردن و سەفەری دەرەوەی ئەو

پێویستە پیاو بیخاتە ژێر پرسیارەوە" ( 3 ). لە ڕۆژی 11/22 دا باوەڕ بوون بە حکومەتەکەی پیرشۆن لە پەرلەماندا خرایە ژێر پرسیار و لێکۆڵینەوە و پاشان دەنگی لەسەر درا. بە بوونی نزیکەی نیوەی دەنگەکان حکومەت توانی لەسەرکار بمێنێتەوە. ڕۆژنامەی یۆتێبۆری پۆستن (Goteborg Posten -GP) دەنوسێت " بەڵام ئەمە نیشانی دا کە پیرشۆن لە دەرەوەی وڵات بۆی نییە هەموو قسەیەک بکات" ( 4 )

## ئیتالیا

لەساڵانی 1992و1993دا ناڕەزایی خەڵک لە ئیتالیا سیستیمی دەسەڵاتداریتییان ڕوخاند. ڕۆژنامەی( Svenska Dag bladet -SvD) سڤینسکا داگبلادیت دەنوسێت( 5 ): سیستیمی دەستەڵات دابەشکردن لە شێوەی فیودالدا بوو. حیزبەکان خۆیان بەخاوەنی دامودەزگا دەوڵەتییەکان دەزانی و بەشێوەی ڕێژەیی و قەبارەی حیزبەکە دەستەڵاتەکان دابەش کرابوون. ئەو پارتەی بیویستایە شوێنی خۆی بەهێز بکات دەبوو زۆرترین ئەندامی هەبێت. ئەمانەش پێویستیان بە گیرفان و جزدانی ئەستوور هەبوو. کارتی ئەندامەتی وەکو بوونی ئەکسییەی ( سەهمی ) شەریکە کاری دەکرد. زۆرکەس کرابوون بەئەندام بەڵام هەرگیز پارەی ئەندامەتییان نەدابوو. هەندیک کەس ئاگادار نەبوون کە کراوون بە ئەندام، هەندیکی دیکە هەر لە ژیانیشدا نەبوون. هەر کەسێک شوێنی لە حیزبدا بەرزتر بوایە پارەی بەرتیلی زیاتری وەردەگرت. ئەم بارو دۆخە سیاسییە وڵاتەکەی بەرەو پەشێوی و لێک هەڵوەشان برد. نەوەی نوێ داوای شکاندنی دەستەڵاتی زۆرانبازە کۆنەکانیان دەکرد. خواستی گۆڕانکاری لە ناو خەڵکییەوە دەستی پێکرد و پاشان دامودەزگا دادگاییەکانیان گرتەوە. لە دوای شەڕی جیهانی دووەم دادگاکان زۆر بێ هێز بوون، لەبڕیارەکانیاندا سەربەخۆ نەبوون و لە ژێر کاریگەری سیاسییەکاندا بوون. بەڵام لە ژێر فشاری خەڵکیدا توانیان گۆڕانکاری پێویست بهێننە کایەوە و سەربەخۆ و نەترس بن. هەرچەندە ژمارەیەک پارێزەر و حاکم تیرۆر کران، بەڵام گۆڕانکارییەکان بەردەوام بوو تاوەکو هەموو سیستیمەکەی خستە ژێر پشکنین و دادگایی کردنەوە( 6 ).

لێکۆڵینەوە لەسەر تاوان و تاوانکارەکان بەردەوام تووشی دیوارێکی دەستەڵات دەبور کە بەهێزتر بوو لە قانون. هەندێک جار، پیاوە قانونییەکان خۆیان بووبوون بە بەشێک لە سیستیمەکە. کاتێک دیواری دەستەڵاتە سیاسییەکە ڕوخا، هەموو سیستیمەکەش لەگەڵیدا ڕوخا. ئەندامی پەرلەمان و سەرۆکی پارتی ئەنتی مافیا ناندۆ دالا چیسا ( Nando Dala Chiesa ) دەڵێت " یەکەمین جارە لە دوای ڕوخانی فاشییەکانەوە ڕژێمێک دەڕووخێت لە ئیتالیا. هیوادارم ڕووخانەکە گشتی و یەکجاری بێت کە کەس نەتوانێت خۆی ڕزگاربکات و لە جێگای خۆیدا بمێنێتەوە" ( 7 ).

تاساڵی 1993، یەک لەسەر شەشی ئەندامانی پەرلەمانی ئیتالی لە ژێر لێکۆڵینەوەی پۆلیس و دادگادا بوون. بەڕێوەبەرایەتی زۆربەی شارەوانییەکان گۆڕدران، لەو شارانە ( Rom, Milano, Neapel ) ی تێدا بوو. سەرۆکی پارتییەکان ناچارکران یەک لە دوای یەک واز لە کارەکانیان بهێنن و بخرێنە ژێر لێکۆڵینەوەی پۆلیس و دادگاوە. دوو پارتە گەورەکەی ئیتالیا ( پارتی دیموکراتمەسیح و پارتی سۆسیالیست ) پاش دەرکەوتنی تاوانێکی زۆر تیایاندا بەرەو لەناوچون هاتن. ڕۆژنامەنووس ئەندەرش لیندەر( Anders Linder )دەنوسێت " ئەمجارە گۆڕانکارییەکان لە لابردن و گۆڕینی چەند کەسێکدا نەمایەوە، بەڵکو هەموو سیستیمی دەستەڵاتە سیاسییەکەی لە بناغەوە گۆڕی" ( 8 ).


بێتینۆ کراکسیس

بێتینۆ کراکسیس، کە شانزدەساڵ سەرۆکی پارتی سۆسیالیست بوو، تاوانبار کرا بە دروستکردنی شەبەکەیەکی نا شەرعی پارەکۆکردنەوە لە میلانۆ( Milano ). لە هەمانکاتدا بەرتیل وەرگرتن و بە شێوەی ناقانونی پارە پەیدا کردن بۆ حیزبەکەی.

کراکسیس باوەڕی ئەندامێتی پەرلەمانی لێسەندرایەوە و درا بە دادگا. ئەو گووتبووی "ئەگەر من حوکم بدرێم ژمارەیەکی زۆریش لەگەڵمدا حوکم دەدرێن" ( 9 ).


ئەندریۆتیس

سەرۆکی پارتی دیموکراتمەسیح ئەندریۆتیس ( Gialio Andreottis ) لە دوا جەنگی جیهانی دووهەمەوە بەهێزترین سیاسەتمەداری ئیتالیا بوو و جێگەی باوەڕی زۆربەی خەڵکی بوو، 33 جار وەزیر و 7 جار سەرۆک وەزیر بووە.

ئەندریۆتیس تاوانبارکرا بەهاوکاریکردن لەگەڵ مافیا، بەرتیل وەرگرتن و بە شێوەی ناقانونی پارە پەیداکردن بۆ حیزبەکەی ( 9 ).

سەرەنجامی ئەو کەسانەی دەستیان لە تاوانەکاندا هەبووە تاکو ساڵی 1993 بەم شێوەیەی خوارەوەیە ( 9 ).

- 2500 سیاسەتمەدار، کەسانی ئیداری و چەند بازرگانێک تاوانبارکراون.
- 1356 کەسی سیاسی و ئیداری زیندان کراون.
- 1116 کەسی سیاسی و ئیداری لەژێر لێکۆڵینەوەی پۆلیس و دادگادان.
- 3 سەرۆکی پارتی سیاسی وازیان لە کارەکانیان هێناوە.

- لادان لە هەر قانونێک سزا یەکی تایبەتی هەیە نەک سوڵحێک
- لەم هەموو تاوانبارانە تەنها زیندانێک دروست دەکرێت نەک یەکێتیەکی نەتەوەیی

## سوید ـ مۆتالا

دادگا حوکمی شەش لێپرسراوی بەرزی سیاسی دەدات لە شاری موتالا (Motala). دادگا ئەمانە تاوانبار دەکات بە خراپ بەکارهێنانی ئەو باوەڕەی کە خەڵکی پێی دابوون. لە سەرو هەموویانەوە سەرۆکی شارەوانی سۆلڤێ کۆندرادسۆن (Solve Condradsson) بوو، کە بە ساڵ ونیوێک زیندان و 760 هەزار کرۆنی سویدی سزا درا. تاوانەکان بریتی بوون لە بەکارهێنانی پارەی شارەوانی بۆ جلوبەرگ، کڕین، خواردنەوە، جگەرە، سەفەرکردن و ئاهەنگی ڕۆژی شەست ساڵەی لەدایکبوونی (10).

دادگا بە پێی 37 خاڵ حوکمی تاوانبار دەدات. لەوانە:

- بەکارهێنانی پارە و دارایی گشتیی بۆ کاری شەخسی.
- باوەڕ لە دەستدان بەرامبەر خاوەنی سەرەکی کە (شارەوانییە).

دادگا ئەم حوکمەی دا بۆئەوەی پیشانی بدات بەکارهێنانی پارەی گشتیی بۆ کاری شەخسی تاوانێکی مەزنە. ئەو ڕۆژنامەنووسەی کە سکەنداڵە سیاسییەکەی شاری موتالای دەرخست، مۆری سیترۆن (Moric Citron)، دەڵێت: "بڕیاری مەحکەمە زۆر توندو ئاشکرا نووسرابوو، پێویستە بە ئیجباری هەموو سیاسییەک بیخوێنێتەوە تاکو هەرگیز دوودڵ نەبێت لەوەی کامە ڕاستە و کامەش چەوت. بۆ ئەوەی بزانن پارەی گشتیی بۆ گشت بەکار بهێنرێت نەک بۆ مەبەستی شەخسی" (10).

سەرەڕای ئەو حوکمەش، خەڵکی شاری موتالا نارازین و دەڵێن ساڵونیوێک زیندانیی کەمە. دادگا دەڵێت " کردەوەی ئەم لێپرسراوانە بەشێوەی جیاواز، کاردانەوەی نێگەتیڤی لە سەر شاری موتالا دانا و باوەڕی گشتی خەڵکی بەرامبەر بە سیاسییەکان لەناوبرد". قسەکەری سۆسیالدیموکراتەکانی ئەم شارە، ڕۆنی هادارسۆن (Ronny Hadarzon)، دەڵێت "سکەنداڵی شاری موتالا وای لە خەڵکی کرد کە ئامادەیی خۆیان دەرببڕن و بێنە ناو سیاسەتەوە بۆ ئەوەی کاریگەرییان هەبێت لە ڕووداوەکاندا. ئێستا پێویستە ئێمە پیشانی بدەین کە دەبێت جێگەی باوەڕی خەڵکین" (10).

## کۆریا

پاش دۆڕاندنی هەڵبژاردنی ساڵی 1998، سەرۆک کۆماری کۆریای باشوور بە چاوێکی پڕگریانەوە سەری بۆ گەلی کۆریا دانەواند و ماڵئاوایی کرد. چەند کەسێک لە هاوکارەکانی و کوڕەکەی بە تاوانی بەرتیل وەرگرتن زیندان کران. سەرۆک کۆمار کیم یۆنگ سام (Kim Young Sam) داوای لێبووردنی کرد بۆ ئەو بارە نابوورییە خراپەی کە ئەم بۆتە هۆکاریو لە دوای خۆی بەجێی دەهێڵێت. کیم بڕیاری دا ئیتر واز لە سیاسەت بهێنێت (11).

## یابان

سەرۆکی بانکی مەرکەزی یابان، لە مانگی سێی 1998 دا، پاش سەردانەواندن لە پەرلەماندا داوای دەستکێشانەوەی لە کارەکەی کرد. لەبەر ئەوەی یەکێک لەو سەرۆکی بەشانەی لەبەردەستیدا کاریان دەکرد بە وەرگرتنی بەرتیل تاوانبار کرا. سەرۆکی بانکی مەرکەزی خۆی بەشداری ئەم سکەنداڵی بەرتیلوەرگرتنەی نەکردبوو. بەڵام لە یابان عادەت وایە سەرۆک یاخود بەڕێوەبەری گشتیی دامودەزگایەک واز لە کارەکەی دەهێنێت ئەگەر کەسێکی خوار خۆی سکەنداڵێک بکات. ئەمەش بۆ ئەوەی نارەزایی و دژایەتی خۆی پیشان بدات بەرامبەر ئەو کارە خراپەی کەسێکی خوار خۆی دەیکات. لەهەمان کاتدا بۆ پاراستنی ناوبانگی ئەو ڕێکخراو دامودەزگاییەی کە ئەم کاری تێدا دەکات (12).

## کوردستان

نموونە زۆرن لەسەر ڕوداوەکانی دەرەوە، بەڵام زۆربەیان هاوبەشن لە بوونی چەند خاڵێکدا وەکو: تاوان، تاوانبار، دادگایەک، قانونێک و سزایەک. هەموو ڕوداوەکان ئەوە دەسەلمێنن کەلە کۆمەڵگای داد دا دەستەڵاتی سیاسی چەندە مەزن بێت دەبێت لەژێر بڕیاری خەڵکی و قانونی نەتەوەکەدا بێت. دەستەڵات هەرچەندە بەرز بێت دەبێت لە خزمەتی گشتیی کەسەکاندا بێت. بوونی دادگایەکی نەتەوەیی و قانونێک دەتوانێت یەکێتی نەتەوەیی دروست بکات.

لادان لە هەر قانونێک سزایەکی تایبەتی هەیە نەک سوڵحێک. پێچەوانەی کۆمەڵگای داد کۆمەڵگای جەنگەڵە کە هێز تێیدا حوکم دەکات نەک قانون. تاوانبار سزا نادرێت بەڵکو سوڵحی لەگەڵدا دەکرێت. ئەم سیستیمی جەنگەڵە نەتەوە لەناو دەبات نەک یەکێتی تێدا دروست دەکات.

خەڵکی ئینگلتەرە 349 ساڵ لەمەوپێش سنووریان بۆ دەستەڵاتی پادشا دانا و لەسەرخیانەتەکەی دادگاییان کرد. مەسعود بارزانی لە سەرەتای هەشتاکاندا لە پێش سوپای ئێرانەوە هاتوو کوردستانی بۆ گرتن. لە 1996 دا لە پێش سوپای عێراقەوە هاتوو کوردستانی تەسلیم کردن. لە

1997 دا له پێش سوپای تورکیاوه هاتوو کوشتاری کوردی باکوور و باشووری بۆ کردن. له کۆمەڵگای دادوەریدا خیانەت بە نەتەوە ڕەنگی کاڵو تۆخی بۆ نییه، بەڵکو جەمسەرگرتووە. ئەوکەسەی لەو سنووره سووره دەپەڕیتەوه لە بەرەی دوژمنە. ئەو کەسەی تاوانێک دەکات ئەگەر چی پەشیمانیش ببێتەوه سزای خۆی هەر وەردەگرێت. دادگای پەرلەمانی ئینگلیز بە سەرپەڕاندن سزای پادشاکەیان دا، بەڵام کورد دادگایەکی نەتەوەیی نییه تاوەکو سزای خیانەتکارەکانی خۆی بدات.

سەرۆک وەزیرانی سوید پێرشۆن بەبێ پرسی وەزارەتی دەرەوە دەعوەتی سەرۆک کۆماری چین دەکات، دەدرێت بە بەشی "دادگای" پەرلەمان. مەسعود بارزانی دەعوەتی دوو سوپای داگیرکەر دەکات و پێشی سوکایەتییە لە پەرلەمانی کوردیدا دانیشێت.

لە سوید باوەڕیی بە سەرۆک وەزیرەکەیان دەخەنە ژێر پرسیارو لێکۆڵینەوە لەسەر ئەو وتەیەی دەربارەی سیاسەتی چین گوتبووی. جەلال تاڵەبانی لە دانوستاندنیساڵی 1983 لەگەڵ ڕژێمی سەدام دا دەڵێت "سەدام حوسێن ناوبژیکەرە نەک دوژمن". حوسێن کامیل یەکێک بوو لە بەرپرسیارانی سەرەکی شەهیدکردنی دوو سەد هەزار کورد بە ئەنفال و کیمیاوی. جەلال تاڵەبانی دەعوەتی دەکات بۆ کوردستان و داوای کردنەوەی بارەگای بۆ دەکات. پاش کوشتنەکەی بە "مەرحوم" ناوی دەبات. سەرکردەکانی کۆمەڵەی زەحمەتکێشان بزووتنەوەیەکی کورد دەخەنە ژێر دەستی چەند فارسێکەوه و ئەوانیش لەناوی دەبەن. کۆمەڵە لە پێناوی هێنانە سەرکاری ڕژێمێکی کرێکاری فارس لە ئێراندا نەتەوەی کورد بەکوشت دەدەن. سەرۆکەکانی حیزبی دیموکرات هەموویان بە دوای یەکدا شانازی بە ئێرانی بوونی خۆیانەوه دەکەن. پاش کوشتاری مەهاباد و سنە و نەغەدە، مەلا عەبدوڵای سکرتێری گشتی حیزب دەڵێت: "لە ناخی دڵەوە تەئەسوف دەخۆم بۆ ئەوانەی کە خۆیان لە ئێمە بە ئێرانیتر دەزانن...". بە پێچەوانەی سیاسەتمەدارانی سویدەوه، سەرۆکەکانی کورد هەرچەندە بە قسەو بە کردەوە کورد سوک و ڕسوا دەکەن، بەڵام دادگایەکی نەتەوەیی نییه تاکو ئەمانە بخاتە ژێر پرسیار و لێکۆڵینەوە.

دادگا سەرۆکی دوو حیزبە گەورەکەی ئیتالیا تاوانبار دەکات بە هاوکاری کردن لەگەڵ مافیا، بەرتیل وەرگرتن و پارە پەیداکردن بە شێوەی ناقانونی بۆ حیزبەکانیان. سەرۆکی حیزبە کوردییەکان نەک تەنها ناشەرعیانە پارە بۆ حیزبەکانیان پەیدا دەکەن، بەڵکو بە ئاشکرا هاوکاری لەگەڵ داگیرکەراندا دەکەن و لە بری ئەوە پارەیان لێوەردەگرن.

دادگا لە شاری موتاڵای سوید، شەش سیاسەتمەداری بەڕێوەبەرایەتی شارەوانی بە "بەکارهێنانی ماڵو دارایی گشتیی بۆ مەبەستی شەخسی" تاوانبار دەکات و سزیان دەدا. ئەوان پارەیان بۆ کڕینی جلوبەرگ، جگەرە، خواردنەوە و سەفەرکردن بەکار هێناوە. سزای دادگا بۆ ئەوەیە دەری بخات شتێک قیمەتەکەی چەندە کەمیش بێت بەڵام ئەگەر لە پارەی گشتیی خەڵکی بکرێت تاوانێکی مەزنەو لێبوردنی نییه. ئەگەر ئەم قانونە لە کوردستاندا پیادە بکرێت دەبێت ژمارەیەکی زۆر لێپرسراوی حیزبی شوێنەکانیان بۆ زیندان بگوێزنەوە.

سەرۆک کۆماری کۆریا لە کارەکەیدا سەرکەوتوو نەبوو، لەبەرئەوە خەڵکی لە هەڵبژاردندا دەنگیان بۆ نەدا و دۆڕاندی. ئەویش سەری بۆ دانەواندن و داوای لێبوردنی لێکردن. بەڵام سەرۆکی حیزبە کوردییەکان چ کارێکیان لە پێناوی خزمەتی کوردا کردووە تاکو سەرکەوتوو نەبووبن تییدا. بەپێچەوانە تەنها ئەو کارانەیان کردووە کە دژ بە خواستی خەڵک و یەکێتی و سەربەخۆیی کورد بووە. بەڵام نەک سەریان هەر بۆ کورد دانەنەواند بەڵکو ئەوان سەریان بە هەموو نەتەوەی کورد دانەواندووە و بە خواستی خۆیان بەڕێوەی دەبەن.

ئەگەر ئەو عادەتەی یابان بهێنرێتە کوردستانەوە ئەوا کەس نە بە لێپرسراوی حیزبی و نە بە بەڕێوەبەری گشتی دەمێنێتەوە. لەم ڕووداوەی یاباندا نەک تەنها قانون، بەڵکو هەست بە لێپرسراویکردن، مۆڕاڵ و دیسیپلین دەور دەبینێت. لێپرسراوە سیاسییەکانی کورد تەنها نەبوونی قانون نییە کە ئەم کارانە دەکەن بەڵکو نەبوونی مۆڕاڵ و دسپلینیشە.

کورد ئەگەر دەیەوێت وەکو نەتەوەیەک بمێنێتەوە دەبێت خۆی بڕیار بدات لە کام کۆمەڵگادا بژی. ڕاستکردنەوەی ڕێبازی بزوتنەوەکە پێویستی بە دسپلین، قانون و دادگایەکی نەتەوەیی هەیە نەک سوڵح و خۆبەدەستەوەدان. تاوانباریش دەبێت سزا بدرێت هەرچەندە بەهێز بێت. لەم هەموو تاوانبارانەش تەنها زیندانێک دروست دەکرێت نەک یەکێتیەکی نەتەوەیی.



1998/03/24

سەرچاوەکان:


1-Sir Mattew Hale, 1606- 1676, Alan. S 58-73
The British Empire, 1558-1983, lioyd,Trevor Owen
2-Gefle Dagblad, Owe Nillson 96.11.8
3-Dagens Nyheter(DN), Goran Eriksson o Lotta Samec 96.11.20
4-Goteborg Posten(GP), Lagg papperen pa bordet nu 96.11.23
5- Svenska Dag bladet(SvD),Rolf Gustavsson, 93.8.1
6- Tempus 1993 nr. 18-24
7-Svenska Dag bladet(SvD), Ann-Marie Kjellander, 1993.3.14
8- Svenska Dag bladet(SvD),P J Anders Linder, 1993.11.23
9- Tempus 1993.4.15
10- Dagens Nyheter(DN),98.1.15
11- Metro 98.2.21
12- Text Tv 98.3.12

# هەمووکەسێک زاتی ئەوە ناکات ڕاستی بڵێت



سەبری بۆتانی

من ناوم باهوز بۆتانیە، تەمەنم 72 ساڵە. پیشەم خەبات و تێکۆشان و ڕاکردن و خۆشاردنەوە بووە. هەر لە تەمەنی 14 ساڵیمەوە تا ئیستا هەر لە خەبات و تێکوشاندامە، بەلام وەک هەر کوردێکی دیکە منیش جگە لە چەرمەسەریی بەولاوە دەستکەوتم نەبووە. ئاشنایان بەشەڕی خۆکوژی و براکوژی کردین کە ئەویش بەپێی بیر و بۆچوونم لە فەرهەنگی شۆڕشگێڕیتی و کوردایەتی ڕەسەندا نییە و تەنیا لە فەرهەنگی پارتەکاندا دەبینرێ.

**بێ پەردەو بە دەنگێکی بڵند دەمەوێت بڵێم:**

**" هێنانی سوپای داگیرکەرانی کوردستان جگە لە تاوان و خیانەت بەولاوە، ناوێکی دیکەی ناتوانم لێبنێم. بەلام بە داخەوە زوربەی شاعیر و ماعیر و نووسەرو مووسەرو ڕۆشنبیرەکان ئەمە ناڵێن"**

**پ 1 : بە خەیاڵتاندا دەهات ڕۆژێک بێت کە کوردستان بەجێ بهێڵێت ؟**

هەرگیز نا، مرۆڤی کورد بە درێژایی مێژوو نەک لەبەر خۆشی و پێ ڕاڕیبوونی خۆی، بەڵکو بە هۆی زەخت و زۆر و تاڵان و بڕۆی داگیرکەر و دوژمنانییەوە ناچاربووە نیشتمانی خۆی بەجێبهێڵێ و پەڕیووەو ئاوارەی هەندەران بێت. منیش ئەوەتی خۆم ناسیوە و هەستم بە ژان و برکی نەتەوەکەم کردوە، ئەو دیاردە تاڵەم بە چاوی خۆم بینیوە و ئیستا بۆ خۆشم لەو حاڵەدا دەژیم. دوور لە ولات و گەل و خاکی خۆم، چاوەڕوانی و بە ئومێدی گەڕانەوە لە وڵاتێکی ئازادو سەربەستدا و دوور لە دەستەڵاتی داگیرکەر.

**پ 2 : چۆن بوو ڕێت کەوتە ئەوروپا ؟ ئیستا لە ئەرویج خەیاڵەکانت کوردستانی تێدا ماون ؟**

دەبێ بڵێم: بای ڕەش هێنامی، وەکو زووربەی هەژارانی گەلەکەم لە کاتی کۆچ و ڕەوو لە ژێر زوڵمی دوژمنی بەعس. هەر وەکو ئەو کاتەم دێتەوە بیر کە لە تەمەنی پێنج ساڵیدا بووم لە گەڵ زۆر کەس، لە ترسی کوشتوبڕی ئەتاتورک و پاش ئەمانی شۆڕشی شێخ سەعید ( 1925 )و شۆڕشی ئاگری( 1930 )، پەنامان بردە بەر ناوچەکانی باشووری کوردستان.

بەڵێ ئیستاش هەر خەون بە کوردستانەوە دەبینم و خەون و خەیاڵم بە پەرۆشەوە دەڕواتەوە بۆ هەژارگەی کاول و وێران و ژێر چەپۆکی داگیرکەر کە لە هەموو لایەکەوە وەک گورگ دەمیان تێناوە، ئەویش لە سایەی شەڕی ناوخۆیی پارتەکانەوە.

**پ 3 : هێنانی سوپای داگیرکەرانی کوردستان، کۆچکردنی خەلک، خنکان و کوژرانیان لە ڕێگای دەرەوەدا، ئەمانە چی لە لای تۆ دروست دەکەن؟ هەروەها ئەمانە چی دەگەیەنن؟**

یەک لەو دیاردە هەرە کۆنانەی کە هەمیشە کۆسپ بووە لە سەر ڕێگای براقی نەتەوایەتیماندا، هاوکاریکردنی سەرۆک عەشیرەت و ئیل و ئەمارەتەکانی کوردی بووە لەگەڵ دوژمنان لە دژی لایەن و ناوچەیەکی دیکەی کوردی. هەزار مەخابن ئەو کردەوە ناکوردانەیە ئەمرۆکەش لە لایەن دەستەو تاقم و ڕێکخراوی بەناو کوردییەوە لە ئەستۆو داوێنی کورد نەبۆتەوە. بەکورتی دەتوانم بڵیم هەر جۆرە هاریکارییەکی لە گەڵ داگیرکەرانی کوردستان بەهەر برو بیانویەکەوە ئەنجامەکەی بە زیانی کورد دەگەڕێتەوەو تەنیا داگیرکەران و نۆکەرانیان بوونە کە سودیان لە ناتەبایی و ناکۆکی کورد وەرگرتووە. بێ پەردە وبەدەنگی بلند دەمەوێ بڵێم کە ئەو جۆرە هاوکارییانە جگە لە تاوان و خیانەت بەولاوە چ ناوێکی دیکەی ناتوانم لێ بنێم. بەلام

بەداخەوە دەشڵێم کە زووربەی شاعیرو ماعیرو نووسەرو مووسەر کۆچکردن و خنکاندن و کوژرانی گەلەکەشم ئەوە دەگەیەنێ کە گەلی کورد، لە لایەن سەرجەم داگیرکەرانیەوە هەرەشەی ژینۆساید و فەوتاندنی لێ دەکریت، بە مەبەستی نەهێلانی گەلی کورد بۆ وەی بتوانن بە ئاسودەیی خاک و سەروەت و سامانی کوردستان تالان بکەن. ئەو سیاسەتی کۆچپێکردن و چۆلکردنی ولاتی کوردەش هەر لە درێژەی سیاسەتە شۆڤێنیستیەدایە. بەلای منەوە یەکگرتوویی هێزەکانی گەلی کورد، بە مەرجی بوونی ستراتیژییەکی کوردستانی و سەربەخۆیی لە تێواتیاندا، کارکردن و رۆشنبیرەکان ئەمە نالێن.

لە بواری دیپلۆماسی داو یەکخستنی هێز و توانای گەلی کورد لە پێناو ئەو ئامانجانەدا دەتوانێت دەورێکی کاریگەر ببینێ، لەوەدا کە کورد بۆ خۆی بتوانێت پێش بەو کارەساتانە بگرێت کە بەسەری دێنن و بە مافی رەوای خۆی کە ئازادی و سەربەخۆییە شاد ببێت ، کە ڕێگای ڕاست و دروستە، واتە وەک خۆشتان دەڵێن( جیابوونەوەو پێکهێنانی دەولەتێکی سەربەخۆ مافێکی موتلەقی خەڵکی کوردە ).

**گۆڤاری کۆنتراکت پرسیارنامەی ئاراستەی چەند کەسێکی خاوەن بڕوانامەو نووسەر کردووە. بۆ ئەوەی لە ڕێی ئەو پرسیارانەوە راو هەڵویستیان لەسەر رووداوەکان دەربڕن. هەر لەم ژمارەیەدا وەلامی یەکێک لەو پرسیارلێکراوانە بلاو دەکەینەوە. میوانی ئەم ژمارەیە شمان سەبری بۆتانی شاعیرە.**



کۆمەڵێک منداڵی کورد وێنەی کەسوکاری ونبوویان هەڵگرتووە

# ئەو ڕۆژەی "تریفەی هەڵبەست" بۆم بوو بە "کەژاوەی گریان"



**کامەران قازی**

**دووڕم خەنەوە لە ووشەیەک :**

- **فوو لە چرای بیرکردنەوەم بکات**
- **لە پێناوی هیچدا بەکوشتم بدات**
- **خوێنی براکەم پێ بڕێژێت**

**ئەز شاعیر نیم، بەغیلی بە شیعرەکانت بەرم. ئەز شاعیر نیم، ڕقم لە خۆم، لە تۆ بێتەوە، کە بۆچی ئەو شیعرە جوانە بەرزانە هی من نەبوون. ئەز شاعیر نیم تا لە بەرهەمی زۆرت بترسم. ئەز شاعیر نیم**

ساڵی ( 1969-1970 ) من قوتابیەکی ڕوتەڵەی، کوڕی پیاوێکی هەژار بووم. لە پۆلی شەش،قوتابخانەی سەرەتایی ( مەولانا خالد )، لە گەڕەکی ئەزمڕی شاری سلەیمانی دەمخوێند. لەگەڵ (کاک کاوەی عومەر هەڵمەت )دا هاوپۆل بووین. ئەوسا من تەنیا ( 5 ) فلس ڕۆژانەم هەبوو تا لە قوتابخانە یان لە ڕێگا خەرجی بکەم.

کە(تریفەی هەڵبەست)ی تۆ بڵاوبووەوە، کاک کاوە چەند دانەیەکی هێنا بۆ قوتابخانەو پێشنیازی کردین، هەر کەسێک دەیەوێت دەتوانێ ڕۆژی ( 5 ) فلس تا مانگێک بە قەرز بیکڕێت. منیش یەکێک بووم لەو کەسانەی دانەیەکم بەو مەرجەو بەقیستی یەک مانگ کڕی. جا بێنەو بیخەرە بەرچاوی خۆت، منداڵێکی هەژاری کورد، ڕۆژی ( 5 فلس ) ڕۆژانەی بێت و لە دەمی خۆی بگرێتەوە بیدات بە ووشەی جوان.

یەکەم کتێبێک کڕیم ( تریفەی هەڵبەست )ەکەی تۆ بوو، ئەویش بەو پارەیەی کە ووتم لەدەمی خۆمم گرتەوە. زۆر چاکیش لە یادمە ڕۆژێکیان دایکم ووردەی پێ نەبوو، ( 25 فلس )ی دامێ بەمەرجی ئەوە باقییەکەی بۆ بهێنمەوە.

کاتێک چوومە قوتابخانە، دیم قوتابییەکان دەوری کاوەیان دابوو. هەر کەس ( 5 فلس )ی خۆی دەدا. بۆ نەگبەتی منیش کردم و ( 25 فلس )ەکەم خستە ناو کیسە نایلۆنەکەی بەردەمی کاوەوە. بەداخەوە ئەویش سەرگەرمی قوتابییەکانی تر بوو ئاگای لەوەی من نەبوو تا هەموو پارەی خۆیان داو منیش ڕاوەستام بۆ ئەوەی ( 20 فلس )ی باقیەکەم پێ بداتەوە. کاوە بڕوای پێ نەکردم ووتی "تۆ هەر پارەت نەداوە". منیش قورعانم خوارد، خوام خوارد کە پارەکەم خستۆتە ناو کیسەکەوەوە.ئیتر خۆشم پێ نەگیراو دامە پرمەی گریان. گریام لە بەر دوو شت : یەکەم لەبەر ئەوەی لام گران و شەرم بوو ئیتر قوتابییەکان بە سوکی تێم بڕوانن و وا بزانن درۆم کردووە. دووەمیش لەبەر چوونەوەم بۆ ماڵەوەو زراوم چوو بوو، نەم دەزانی لەلای دایکم چی بڵێم، چۆن باوەڕم پێ بکات، ڕەنگە وا بزانێت هەموو پارەکەم داوە بە نوقوڵ و شیرینی !. زۆر گریام و بەمە دیار بوو کاوە بەزەیی گرتی ووتی:" ڕاوەستە با پارەکە بژمێرم". چەند جارێک پارەکانی ژمارد و هەر ( 25 فلس )ی لێ زیاد بوو، ئیدی ( 20 فلس )ەکەی پێدامەوە. منیش فرمێسکەکانم سڕین و ئاهێکم پیادا هاتەوە. بڕێکی باشیش بوومە مایەی گاڵتەو گەمەی ناو هاوڕێ لاسارەکانی قوتابخانەکەم. ئەو ڕۆژە ( تریفەی هەڵبەست ) یش بۆ یەکەم جار بۆم بوو بە ( کەژاوەی گریان ) .

ئێستا گەلێک لەوسا گەورەترم. ئەوسا بۆ ( 5 ) فلس گریام کە لە دەمی خۆمم گرتەوەو بۆ ئەوەی یەکەم کتێبی ژیانم کڕی، ئێستاش ئەگەر لە دەمی خۆشمی نەگرمەوە، دەتوانم کتێب بکڕم، کتێب بۆ کوڕو کچەکەشم دەکڕم، شیعرەکانی تۆشم کڕیون. لە زۆر وێنەی شیعریشت ڕاماوم و گوێم لە دەنگ و چاوم لە ڕەنگیشت بووە، لە شاخیش تۆم بینیوە. شادمانیش بووم، کە دانیشتوی ئەو گوندە هەژارەی من مامۆستای منداڵەکانیان بووم بۆ کۆڕی شیعرت وەک پورەی هەنگ سەربان و بنبانی مزگەوتیان پڕ کردبوو. خۆشییان بە وشەکانت دەهات و ووشەکانی تۆیان لە هەموو شتەکانی خۆیاندا دەناسییەوە. پێیان دەوتم :" مامۆستا، ئەو شاعیرە هەموو ووشەکانی ئێمەی دەزانی و بەکاری دەهێنا ! " لە دڵما، لە ناخما، خۆشحاڵ دەبووم، دەمگووت دەی خوایە ئەکانێک، دەی خوایە جوڵەیەک... دەمزانی کە قوڵیی ووشەکانی تۆ تا چ ڕادەیەک بۆ ئەو هەژارە نەخوێندەوارانە، کاریگەرە. من هەمیشە تۆم

وەک شاعیری نەتەوەکەم ناسیوەو بێئاگاش نەبووم لە شیعرەکانت، وەلی دڵم نەهاتووە ختورەی ناخۆش بە ڕۆحما بێت . من لە زوربەی شیعرەکانتا بۆ نەتەوەکەم و ئازارو خەمەکانی گەڕاوم،تیادا دۆزیومنەتەوە، بۆیە دەرگام لەسەر ختورەکان داخستووە. تۆ بۆ من هونەرمەندیکی گەورەی، بۆیە ناتوانم هەروا بە ئاسانی لەکۆڵ خۆمت کەمەوە. تۆ ئەگەر سیاسیەک بایتایە، دەمێک بوو قوفڵم لە خویندنەوەی ووشەکانت دابوو، بیرەوەرییەکانتم دڕاندبوو، یادانەوەکانتم تووڕ هەڵدابوو.

ئەز شاعیر نیم بۆیە قسەم بێ غەلەو غەشە، نە تەونی فرت و فیل لە سەر ڕێگەی ووشەکانتا ڕادەخەم، نە دوربینیی تەمگرتووم لەبەرچاوە ، نە دەمارگیریی و ڕق و کینەم لە دڵدایە، تاکو دەهۆڵت بۆ بکوتم. من دەمەوێ بەرزی و جوانی وینەکانت نەشیوێنن. ئەوەی پردی نیوان من و تۆیە، شیعری جوان و ڕەسەنی تۆ و خەم و کەسەری منە بۆ هەر شتێک بە کوردی بێ و بۆ کورد نەبێت.

تۆ پێم دەڵێیت: هۆ شێتەکەی بنار پیری ! زریانی تووڕەی میرگەپان. کەڵکی قزلەر. چرای کزی ئەشکەوتەکەی حەمید یاخسەمەری. مەرگە بەرزەکەی مەلا زەوقی. بەربەیانی پڕ لە ترسی گوندە جوانەکەی هەناران. تۆ پێم دەڵێیت: ئەی ماوەی مەرگ و ژیان. ماوەی نیوان دوو "کاریزە". ئیوارەی پڕ لە هەڵمەتی کانی بەردینەی هاوڕێ جەبار. گەڕانەوەی پاش شەوانی بەرەنگاری. ئەی تەقەی دەرگای لە ناوەختی دلیرە شێت. ئەی تەنوری داگیرساوی گڕ لە خۆ بەرداو بۆ نانی پیشمەرگە. ئەی هەزاران ختورەی پڕ لە ترسی ئەو دایکانەی لە ژێر سیبەری تفەنگ و پۆستاڵی عەرەبدا، لە نیوانی دوو مەرگدا، مەرگی هاتن و چوونەوە، دەمردن و دەژیانەوە. تۆ پێم دەڵێیت: ئەی ئەو دڵەی لەسەر لوتکەی پیرەوە بۆ باڵا قشتە جوانەکەی حەمرین دەسوتای، ئێستاش پێم دەڵێێت: وەرە وەختە دەنگ بدە بە سەوز؟!!!

چەند هەستم بە کەمی خۆم کردو کێوی هیوام ڕما. چەند هەستم بە بێکەسی خۆم کرد، هەستم کرد چەند درۆزن بووم، ئەو ڕۆژەی خەڵکی گوندی قزلەرم بانگ کرد، پێم ووتن: "*وەرن گوێ لە ووشەی وەک گوڵ بگرن*". ئایا دەکرێت لەپاش ئەم بانگەوازەت، ئیدی باوەڕ بەوە بکەم کە لایەنی <u>خێر</u> لە لایەنی <u>شەڕی</u> پەیڤت بەهێزترە؟!!

**تۆ پێم دەڵێیت <u>ئێستا</u> وەختە وەرە دەنگت بدە بە سەوز!!! سەوز چییە؟ فەلسەفەیە؟ بیرە؟ پرۆژەیە؟ چییە؟ چییە سەوز؟ کە پێم دەڵێیت دەنگ بدە بە سەوز. بانگیشم دەکەیت دەنگ بدەم بە زەرد.**

من پێم وابوو، تۆ دەزانی کە هاتنی سوپای دوژمنانی کورد لە باشوردا لە بەرەکەتی شەڕی براکوژییە ! من پێم وا بوو تۆ دەزانیت کە ئاوارەبوونی ئێمە، دەربەدەری هەزارەها کورد لەبەرهەمی شەڕی براکوژییە ! من پێم وابوو تۆ دەزانیت لەنیوان زەردو سەوزا، ژنەیەک بەئاستەم بریقەی دێت! زۆر نزیکە ببێتە لافاو، ببێتە لێشاو زەردو، سەوزو کەسک و ئاڵ و شین و مۆر و هەموو ئەو ڕەنگانە.

لەبەردەم خۆیەوە ڕامالێت.. .. من پێم وابوو ... پێم وابوو، ڕەنگە دوا شیعرت ئیتر بەناوی (<u>دەنگ بدە بە کوردستان</u>)ەوە دەبێت، کە هەق بوو ناوی وابێت. من پێم وا بوو. بەڵام داخەکەم تۆ کوردستان بچوکتر لە دوژمنەکانیش دەبینیت، هەر لە سەوزدا دەیدۆزیتەوە.

تۆ دەبوو شاعیری نەتەوەی کورد بیت،تۆ دەبوو باڵای شیعرت ، لە باڵای گرگنیان بەرزتر بێت ، تۆ دەبوو لای ئێمە بایتایە، ئێمەیەک کە یەکەم کتێبی ژیانمان ، تریفەی هەڵبەست بوو ، نەک لە پاڵ سێبەری خەڵکانێکدا کە ئەمرۆڤ لە ئەسڵ و فەسڵ و کوردبوونیان دوو دڵە.

(مارسی 1988.).

**ئەوەی پردی نیوان من و تۆیە، شیعری جوان و ڕەسەنی تۆ و خەم و کەسەری منە بۆ هەر شتێک بە کوردی بێ و بۆ کورد نەبێت.**

# وەڵامێک بۆ ئاڵۆزکردنەکەی شێرکۆ بێکەس

## بیانووی قسە سەردێڕ نیە

کاک شێرکۆ بێکەس لە "ڕونکردنەوەیەکدا"، لە ژمارە (47)ی شوباتی (1998)ی "کوردستانی نوێ" دا، کە (ی.ن.ک) لە دەرەوە دەری دەکات، ئاڵۆزکردنێکی دەربارەی ئەو چاوپێکەوتنە بڵاوکردۆتەوە کە کۆنتراکتی ژمارە (1) لە گەڵی ساز کرد بوو.

یەکەم، کاک شێرکۆ دەنوسێت: *"هەر کەسێ چاوی بەو سەردێڕانە بکەوێ کە بە درشتی چاپکراون و چاو لە خوێندنەوەی درێژەی قسەکانم بپۆشێت، ئینتیباعێکی وای لا دروست دەبێت کە من شەڕی ناوخۆو شەڕی داگیرکەران و دوژمنانی کورد هەر بە یەک چاو تەماشا دەکەم!"*

وەلام: ئەو سەردێڕەی پەیوەندی بەم بەشەوە هەیە ئەمەیە: "شەڕی یەکێتی و پارتی شەڕی بەرەی گەل و بەرەی دوژمنە" ئەمەش درێژەی قسەکانی ناوبراوە با خوێنەر چاوی لێ نەپۆشێ و بزانێت چ ئینتیباعێکی جیاواز لە سەر دێڕەکە دەدات:

- "لە دوای 31 ئاب و 14ەی ئایارو ئەم ڕۆژگارانەی ئێستاش، شتێک نەماوە پێی بوترێت شەڕی ناوخۆ و براکوژیی. ئێستە شەڕ، شەڕی نێوان کوردو داگیرکەرانێتی، شەڕی نێوان بەرەی گەل و دوژمنانە، شەڕی نێوان لەشکری سەددام و پێشمەرگەو لەشکری ئەتاتورک و لەشکری گریلاکانە. لەبەرئەوە من پێم وایە ئەم بەرانە ئەم و مژیان بە سەرەوە نەماوە. ئێستە لە خوارووی کوردستاندا، دوای هاتنی تانک و تۆپ و دەبابەکانی سەددام، فڕۆکەکانی تورکیا، دروێنەی گیانی خەڵک و پێشمەرگە ئەکەن. بەم پێیە سەنگەرەکان؛ بەرەکانی خۆیان یەکلا کردۆتەوە. هەموو دەمامکەکان کەوتونەتە خوارەوەو دەم و چاوەکان بە هەموو حەقیقەتەکانی خۆیانەوە، ڕەش و سپی، کەوتونەتە ڕوو. لەم لاوە: بەرەی یەکێتی و هەموو ئەو حیزب و ڕێکخراوە نیشتیمان پەروەرانەی کە نەبوونەتە کەوا سووری بەر لەشکری دوژمن. لەولاشەوە: بەرەی دوژمن و پارتی بە هێزی عێراق و تورکیاوە"

کاک شێرکۆ دەنوسێت: "*.. یان هەموو هەڵوێست و سیاسەتێکی یەکێتی نیشتیمانییم لا پەسەندەو بێ قەیدو شەرت داکۆکیان لێ دەکەم*" شێرکۆ دوو نمونە لە سەردێڕەکان دەنوسێتەوە کە یەکێکیانم پێشتر نووسیەوە، ئەمەی تریشیان کە پەیوەندی بەم بەشەی تریانەوە هەیە ئەمەیە: "دەنگ بدە بە سەوز"

وەلام: ئەوەی کە بەرزکردنەوەی ئەم دێڕەش بۆ ئەوە بوبێت کە ئەو ئینتیباعە دروست بکات کە ئەو دەڵێت. ناوبراو خۆی لە پێشەوە وەلامی داوەتەوە کە قسەکەی بێ بناغەیە. چونکە کاک شێرکۆ گوێی خۆی لەو سەردێڕە کەڕ کردووە کە ڕەخنەیە لە یەکێتی و ئەمەیە: "ژنبەسەراهێنانی سەرانی یەکێتی شەخسیی نیە" ئەمەش لەو پرسیارەوە دەرهاتووە کە دەربارەی ئەوە کراوە کە ژمارەیەک لە سەرانی یەکێتی ژنیان بەسەر هاوسەرەکانیاندا هێناوەو ناوبراو بە شەخسیی نەزانیووەو بە هەڵەی لەقەڵەم داوەو ڕەخنەیان لێ دەگرێت.

دووەم. کاک شێرکۆ دەنوسێت: *"نازانم بۆ چی کارگێڕانی کۆڤارەکە بەشێک لە وەلامدانەوەی پرسیاری یەکەمیان بڵاونەکردۆتەوە کە دوابەدوای ئەوەی ئەڵێم: "دەنگ بدە بە سەوز" نوسیبووم: بەلام من ئەمجارە نامەوێ لە ڕێگەی لیستەوە دەنگ بدەم بەڵکو لە ناو "سەوزییشدا" ئەو "تاکانە" هەڵئەبژێرم کە خۆم لە هەموو ڕوویەکەوە پەسندیان ئەکەم!"*

وەلام: ئەمە زانینی زۆر ئاسانە. 1- پرسیارەکە لە ئەسڵدا بۆ ئەوە نەکراوە کە باسی هەڵبژاردن بێت، چونکە شتی وا لە ئارادا نیە. باسی دەنگدان لە هەڵبژاردنێکدا کە بوونی نیە بێ ئاگاییە. ئەسڵی پرسیارەکە بۆ ئەوەیە کە دوای 5 ساڵ و پاش ئەم هەموو کارەسات و دژوارییە ئاخۆ شێرکۆ بێکەس ئێستا دەڵێت چی؟ ئاخۆ دەڵێت دەنگ مەدەن بە هیچیان؟

2- ئێمە نەمان پرسیووە کام سەوز هەڵدەبژێریت؟ سەوزی ئاویی یان سەوزی قەرسیلیی؟ دەنگ دەدەیت بە جەبار فەرمان کە شیعرت پێشکەش کردووە یان بە عومەر فەتاح؟ ئەوە مافی خۆت و نهێنیی خۆتە لە هەڵبژاردندا. نەمان پرسیووە ڕات لەسەر ڕێگای لیستەیە یان ڕێگایەکی تر؟

سێیەم. کاک شێرکۆ دەڵێت: "***وەلامی دوو پرسیار یان سێ پرسیاریان هەر بڵاونەکردۆتەوە.*** *ئەمە لە کاتێکدا کە ئەبوو ئاگادارم بکەنەوەو پێش بڵاوبوونەوە ڕای منیش وەربگرن یان لە بنچینەدا پرسیارەکانیان نەکردایە*".

وەلام: لەو نامەیەدا کە بۆی چووە نووسراوە: "تکایە وەلام کورت و کۆنکرێت. بۆ گۆڤارێکی سیاسی کە بواری شەرحی کەمە. لام وایە هەندێک لە پرسیارەکان وەلامەکەی یەک وشەیە؛ ئا یان نا! **مەرج نیە هەموو وەلامەکان بۆ ئەم ژمارەیە بێت**".

ئەمە بەسە بۆ ئەوەی کە پیشانی بدات سێیەم بەندی نوسینەکەشی لەسەرچاوەیەکی بابەتییەوە سەرچاوە ناگرێت. بەلام دەمانەوێت ئەوەشی بخەینە سەر کە هەندێک لەو پرسیارانە وەکو لە نامەکشدا دەردەکەوێت بۆ ژمارەکانی داهاتوو بووە. بۆ نموونە ئەو پرسیارەی پەیوەندی بە کوردستان جێهێشتنەوە هەیە، هەڵ بگیرێت بۆ ئەو کاتەی لەسەر ئەم بابەتە دەنوسین. دەنا لە هەموو ژمارەکەدا تاکە نوسینێک کە پاشماوەی لێ کەوتبێتەوە ئەوەی شێرکۆیە کە ئەو سنوورەی بڕیووە کە ئێمە لە باری تەکنیکەوە دامان نابوو. ئەمەش لەبەرئەوەی بە حەزمرەوەو جگە لە سەوزە قەرسیلییەکە کە پەیوەندی بە پرسیارەکەوە نیە ئەوی تری وەکو خۆی بڵاو بۆتەوە.

چوارەم. کاک شێرکۆ دەڵێت: "*هەڵوێستی سیاسی من بەرامبەر یەکێتی نیشتیمانی کوردستان لە سەرچاوەی بەرژەوەندی نەتەوەیی و نیشتیمانیی کوردەوە سەرچاوەیان گرتووە*"

وەلام: ئێمە هیچ سەلماندنێکی زانستیمان بە دەستەوە نیە کە بڕوا نەکەین کاک شێرکۆ دنیای ئاوا دێتە بەرچاو، بەلام ئێمە کە خۆمان جیۆلۆجێکمان لەگەڵەو لەسەر ئاو دەنوسین، پیاسەیەکیشە بۆ ئێمە ئەگەر خۆمان ئاوەکان بەرینەوە بۆ سەرچاوەکان.

هەروەها دەڵێت: "*بەلام ئەوەی بە من ناکرێ و بە نارەوای ئەزانم: تێکەڵ کردنی گوناه و خەتاو هەڵەیە لەگەڵ ناپاکی و خیانەت و کۆکردنەوەیانە لەناو یەک جەواڵدا*".

.وەلام: لە ژمارەی پێشوودا باسی بالای بەرزی خیانەتی مەسعود بەرزانیشی کردبوو، ئەی ئێستا دوای نامەکەی سکرتێری ینک و شتی تریش، لەبالای ئەو کەم دەکاتەوە یان خشتێک دەخاتە ژێر پێی ئەمیش؟

ئێمە دنیا وا نابینین کە بڵێین: ناوبراو بازی بەسەر ئەو سەردێڕەدا نەدایە کە ڕەخنەیە لە یەکێتی، خۆی لەوە بێ ئاگا نەکردایە کە پێی وتراوە مەرج نیە هەموو وەلامەکان بۆ ئەم ژمارەیە بن. ئێمە تێگەشتنمان هەیە بۆ ناوبراو کە خۆی بکاتەوە بە کوردستانی نوێ داو، لەوێ لە ناو دەوروبەرەکەی خۆیدا نامۆ نەبێت، تێگەشتنمان هەیە بۆ ئەوەی کەسانێک هەبن ئەو بڕیاری ئینتیباعیان بۆ بدات و ئەو بزنە ڕەشانەی دوێنێ ئەمڕۆ بە قازی سپی ببینن. بەلام ژاکاندنی "کۆنتراکت" بۆ مەبەستێکی نێگەتیڤی نادیار، زەوقی ناوبراو خۆی پیشان دەدات کە خاڵێکی گرنگی شاعیرییە. دنیاش بەوە لای هەموو کەسێک نابێت بە شەو کە کاک شێرکۆ چاوی بۆ بنوقێنێت.

**کۆنتراکت 24.4.1998**

# زمان و دەوروبەر

هێمن

## گرنگ ئەوەیە وشەی بێگانە بە زۆر نەسەپێنرێت

زمان لە گەشەیەکی دینامیکیدایە لەگەڵ دەوروبەرەکەیدا. هەموو ئەو گۆڕانکارییە سیاسی و تەکنیکی و ئابووری و ئایینییانەی کە لە کۆمەڵگادا ڕوودەدەن، ڕاستەوخۆ کاردەکەنە سەر ئەو زمانەی لەو کۆمەڵگایەدا قسەی پێدەکرێت. نموونەیەکی ڕوونی ئەو پەیوەندییەی نێوان زمان و ئایین، بوونی ئەو هەموو وشە ئایینییانەی لەزمانەکانی کوردی و فارسی و تورکی و ئەو زمانانەی دیکەدا هەن کە خەڵکێکی موسوڵمان قسەی پێدەکەن. وشەی (حەرام) و (حەڵاڵ) و (زەکات) و (عیبادەت)، کە بە ئەسڵ وشەی عەرەبین و مانایەکی تایبەتیان هەیە لە ئایینی ئیسلامدا، لە هەموو ئەو زمانانەی دیکەشدا بۆ هەمان مەبەست بەکاردەهێنرێن.

لە کۆمەڵگای ئەمڕۆدا، کە تەکنیک لە پێشکەوتنێکی بەردەوام و خێرادایە، تەکنۆلۆجیا کاریگەرییەکی گەورەی لەسەر زمان هەیە. ئەو کاریگەرییە تەنیا لەسەر زمانی ئەو خەڵکە نییە کە ئەو پێشکەوتنە تەکنیکییەی بەدەست هێناوە، بەڵکو کاریش دەکاتە سەر ئەو زمانانەی کە ئەو بەرهەمە تەکنیکییە بەکاردەهێنن. تەلەڤیزیۆن، کامێرا، ڤیدیۆ، فرێزەر، کۆمپیوتەر کە بەرهەمی تەکنۆلۆجیای بێگانەن، هاتنە ناو کۆمەڵگای کوردییەوەو لەگەڵ خۆیاندا ناوە بێگانەکانیان هێنایە ناو زمانی کوردییەوە. لەبەرئەوەی ئەم ئامێرانە لەلایەن خەڵکی ئاساییەوە بەکاردەهێندران، زۆر بە خێرایی جێگای خۆیان کردوەوە لە ناو زمانی کوردیدا. هەر وەک چۆن ئەم ئامێرانە جۆرێک پێشکەوتنیان هێنایە ناو کۆمەڵگای کوردییەوە، ناوەکانیشیان بە هەمان شێوە پێشکەوتنێکیان هێنایە ناو زمانی کوردییەوە. هێندێک کۆمەڵگا ویستیان لەبری ئەم وشە بێگانانە وشەی "خۆماڵیی" بۆ ئەم بەرهەمە تەکنۆلۆجیانە دابتاشن. بۆ نموونە، لە عێراق، (مذیاع) لەبری (رادیۆ) و (هاتف) لەبری (تەلەفۆن) لە زمانی نووسینی عەرەبیدا بەکاردەهێنران، بەڵام خەڵکە ئاساییەکە لە کاتی قسەکردندا هەر تەلەفۆن و رادیۆیان بەکاردەهێنا.

هێندێک لەو بەرهەمە تەکنۆلۆجیایانە پاش ئەوەی بۆ ماوەیەکی زۆر لە ناو میللەتەکانی دیکەدا جێگای خۆی کردبۆیەوە، دەهاتە ناو کۆمەڵگای کوردییەوە. لەم کاتەدا، ئەو بەرهەمە لەگەڵ ناوە عەرەبییەکەی یان فارسییەکەی یان تورکییەکەی دەهاتە کوردستان و بەهەمان ناو دەناسران، بۆ نموونە: (مبردە)ی عەرەبی لە کوردستانی خواروو بۆ (cooler) و وشەکانی (دووربین)و (دوچرخە)ی فارسی لە کوردستانی ڕۆژهەڵات بۆ (camera)و (bicycle) بەکاردەهێندرێن.

زانست کۆمەڵێک وشەی هێنا ناو زمانی کوردییەوە. بەکردنی خوێندن بەکوردی لە کوردستانی خوارووda کتێبی فیزیا و کیمیا و بایۆلۆجی و ... هتد وەرگێڕدران بۆ کوردی. بە ئامادەکردنی ئەم کتێبە کوردییانە کۆمەڵێک وشەی زانستی (بۆ نموونە وەک: ئەمپێر، وات، پلازما، بەکتریا، ڤایرۆس، ئەلەکترۆن) هاتنە ناو زمانی کوردییەوەو زمانی زانستیی کوردییان پێشخست. ئەم وشە بێگانانە بەشێوەیەکی ئاسایی لەگەڵ گەشەی زمانی کوردیدا جێگای خۆیان کردۆتەوەو بوون بە بەشێک لە زمانەکە. وەرگێڕانی ئەم کتێبانە ڕێگاشی خۆشکرد بۆ کۆمەڵێک زاراوەو وشەی کوردی، کە لە ناو خەڵکدا بەکاردەهێندران، جێگای خۆیان لە زمانی زانستیی کوردیدا بکەنەوە. بۆ نمونە، وشەکانی (نوێڵ)، (جەمسەر)، (هێزی ڕاکێشانی زەوی)، (باسکی هێز)، (لاکێشە)، (کۆکردنەوە). لەلایەکی دیکەوە، لەسەر بناغەیەکی زانستیی هێندێک وشەی تازە داتاشران، بۆ نموونە: (بەڵگەنەویست)، (پیانەهێل)، (لێدەرکردن)، (مورولوولەی خوێن)، (شاپەتکەدەمار)و (ڕەگی دووجا) کە هەم کارێکی زانستی ڕوون دەکەنەوەو هەم زمانی کوردیشیان دەوڵەمەند کرد. لەبەرئەوەی ئەم وشانە لە قوتابخانەکاندا بەکاردەهێندران و قوتابی کورد پێیان ئاشنا بوو، زۆر بە ئاسانیی جێگای خۆیان لە زمانی زانستیی کوردیدا کردەوە. لەبەرئەوەی کە خوێندن لەکوردستانی باشووردا بەکوردی بووە، زمانی زانستیی کوردی لەم بەشەدا پێشکەوتنێکی گەورەی بەخۆیەوە بینیوە. بەکارهێنانی ئەو وشەو زاراوە زانستییانە لەلایەن نووسەرو پسپۆڕی زمانی کوردی لەبەشەکانی دیکەی کوردستان دوو قازانجی دەبێت؛ یەکەم، پێویست ناکات کات و وزە سەرفبکرێت بۆ داڕشتنی وشەی دیکە، کە پرۆسێسێکی درێژخایەن و زەحمەتە، بەڵکو دەشبێتە هۆی ئەوەی کە زمانی کوردی لەبەشەکانی کوردستان زیاتر لێکدی نزیک ببنەوە.

ئیسپانییەکان تا ئێستاش (Arroz=الرز)و (Azúcar=السکر)و (camisa=قمیص) بۆ (برنج، شەکر و کراس) بەکاردەهێنن. ئەم وشە عەرەبیانە لەوکاتەدا چوونە ناو زمانی ئیسپانییەوە کە ئیسپانیا بەشێک بوو لە ئیمپراتۆریەتی ئیسلامیی. وشەی ئۆخەڵا (Ojalá)ی ئیسپانی لە (انشا الله)ی ئیسلامییەوە وەرگیراوەو لە لایەن خەڵکی ئاساییەوە بەکاردەهێنرێت کە مەسیحین. ئیسپانییەکان ئەم وشانەیان لە زمانەکەیان لانەبردوە چونکە جێگای خۆیان لە زمانەکەدا کردۆتەوەو بوون بە بەشێک لێی.

هێندێک لەو وشە بێگانانەی کە لەلایەن خەڵکە ئاساییەکەوە بەکاردەهێنرێن بە شێوەیەک جێگای خۆیان کردۆتەوە لەزمانی کوردیدا کە زمانە ئەسڵییەکە تایان ناسێتەوە. بۆ نموونە؛ وشەکانی فیستیگڵاس (first class)، کۆرناڵ (cornor)، لایمەن (lineman)، سەکن (second)، سایز (side)، پۆدرە (powder)و داشبۆڵ (dash board)، کە لەزمانی ئینگلیزییەوە هاتوونەتە ناو کوردییەوە، کابرایەکی ئینگلیز نایان ناسێتەوە. ئەم وشانە زمانی کوردییان دەوڵەمەند کردووە. ئەم وشە بێگانانەی کە بەرامبەریان لە کوردیدا نییە و جێگای خۆیان لەناو خەڵکیدا کردۆتەوە زۆر لەو وشە داتاشراوانە گونجاوترن کە جگە لە "داتاشەرەکانیان" کەسی دیکە نازانێت مانایان چییە. گرنگ ئەوەیە کە وشەی بێگانە بەزۆر نەسەپێندرێت بەسەر زمانەکەدا بەڵکو لەڕێی بەکارهێنانی سرووشتیی خۆیانەوە جێگای خۆیان بکەنەوە. لەوەش گرنگتر ئەوەیە کە ئەو وشانە لەکوردستان جێگای خۆیان لەناو خەڵکیدا بکەنەوە نەک لە دەرەوە. چونکە ئەگەر ئەو کارە لەدەرەوەی کوردستان روویدات ئەوا زمانی کوردی تووشی دوو گیروگرفتی گەورە دەبێت: یەکەم، ئەو وشە بێگانانەی کە لەزمانی کوردی دەرەوەی کوردستاندا جێگای خۆیان دەکەنەوە، ناگەنە خەڵکی کوردستان و تەنیا کوردی دەرەوە ئاشنا دەبێت پێیان. دووەمیش، لەبەرئەوەی کە کوردی دەرەوەی کوردستان بەسەر چەند وڵاتێکدا دابەشبوون، ئەو وشە بێگانانەی کە دەچێتە ناو زمانی کوردەکانی بەریتانی جیاواز دەبێت لەو وشانەی کە دەچنە زمانی کوردیی کوردەکانی فینلەندا یان سوید یان ئەڵمانیا. ئەمەش دەبێتە هۆی ئەوەی کە بۆ دیاردەیەک کە لە کوردستان نییە، کۆمەڵێک وشەی بێگانە بەکاربهێنرێت کە هەریەکەیان کۆمەڵێکی کەم کوردی تێی دەگەن. بۆیە بەردەوامی لە پەیوەندی نێوان نووسەرانی کوردستان و دەرەوە زۆر گرنگە.

ئەمە گیروگرفتێکە کە لە داهاتوویەکی نزیکدا بەرەنگاری زمانی کوردی دەبێتەوە و ڕاستەوخۆش کاردەکاتە سەر ئەوەی یەکەمی کوردە ئاوارەکانی سوید. ئەم منداڵە کوردانە بە چ زمانێک قسە دەکەن گیروگرفتێکی زۆر لەوە قووڵترە کە لێرەدا بە چەند دێڕێک چارەسەری بۆ بدۆزرێتەوە. بەڵام هەتا زووتر ئەم مەسەلەیە بێتە باس لەناو خەڵکیدا و هەنگاو بۆ دۆزینەوەی چارەسەری بنرێت درەنگە. باروودۆخی کوردستان ئەوەندە سەری باوکودایکی کوردی قاڵ کردووە کەنەپەرژاون ئەم گیروگرفتە بە شتێکی سەرەکیی بدەنە قەڵەم. بەڵام لەڕاستیدا ئەگەر زیاتر لێی ورد ببینەوە، ئەو منداڵانە، کە ئەوەی دواڕۆژی کوردن لە دەرەوەی وڵات، هەتا ئەگەر لە داهاتوودا نەشگەڕێنەوە بۆ کوردستان، دەتوانن گەورەترین خزمەت بە کورد و مەسەلەکەی بگەیەنن. پەروەردەکردنی منداڵێکی کورد لە دەرەوەی وڵات، بۆئەوەی کە هەم وەک کوردێک گەورە ببێت و وەک تاکێکی سەربەخۆش لەو کۆمەڵگایەدا جێی خۆی بکاتەوە، کارێکی سەختە چونکە ئەو منداڵە لەکۆمەڵگایەکی بێگانەدا دەژی و لەژێر کاریگەریی ئەو کۆمەڵگایەدایە. بەڵام ئەم کارە پیرۆزترین ئەرکی سەرشانی دایکوباوکی کوردی دەرەوەی وڵاتە.

# ئۆپەرێتی داستانی گۆڕانکارییەکانی گورگ

**پارچەیەک لە شیعرێکی درێژی**

**لەتیف هەڵمەت**

**دەنگێک**

*گورگ جێگای باوەڕ نیە
جێی گومان و مەترسییە
گورگ هەر گورگە
گوتویانەو دەڵێن: تۆبەی گورگ هەر مەرگە
-کاتی ئەم قسانە نیە
ئەم قسانە سوودی چیە؟
-ئەوەی ئەم قسانە دەکات
لە بەرەی ئێمە نیە
خزمەتی بێگانە دەکات
لەم کەلەی ئێمە نیە...
*ئەوەی پاساو بۆ گورگ بدات
بەرگریی لە گورگ بکات
خۆیشی گورگە
*ئەوەی ڕێ بۆ گورگ خۆش کات
ئەوەی پایە بە گورگ بدات
ئەوەی چاوپۆشیی لە گورگ بکات
خۆیشی گورگە
-ئەوەی خەمی برسیی و هەژارانی نەبێ
-ئەوەی خەمی ڕووت و بێکارانی نەبێ
-ئەوەی خەمی هاوین و زستانی نەبێ
-ئەوەی خەمی هەرزانیی و گرانیی نەبێ
کۆرس: لە ئێمە نیە گورگە...
کۆرس و بینەران پێکەوە: لە ئێمە نیە گورگە
*ئەوەی خەمی ئەم نیشتیمانەی نەبێ
*ئەوەی خەمی ئەم هەژارانەی نەبێ
کۆرس: لە ئێمە نیە گورگە
کۆراس و بینەران پێکەوە: لە ئێمە نیە گورگە
بەرەی ئێمە نیە گورگە
بەرەی گورگە
بەرەی ورگ
بەرەی ورگە
بەرەی ورگە
بەرەی ورگ

# کوردو وەفیق و سیاسەتی ئەمریکی

**وەرگێرانی بە دەستکاریکردنەوە: هێمن**



**ئەگەر گۆڕانکاریی لە عێراقدا دانانی جەنەراڵێک بێت لە جیاتی سەددام حوسەین، مانای وایە مەسەلەی کورد لەسەر دەستی ڕێکخراوە کوردییەکاندا، نەچۆتە حسابەوە.**

ساڵی (1991) سی ئای ئەی، بەفەرمانی سەرۆکی ئەوکاتەی ئەمریکا (جۆرج بوش) دەستی بەکارکرد بۆ لابردنی سەددام. لەو ساڵەدا سی ئای ئەی (CIA) بیست ملیۆن دۆلاری سەرفکرد لە پڕوپاگەندە دژی سەددامو یانزە ملیۆن دۆلاریشی بەیارمەتی دا بە ئۆپۆزیسیۆنی جیاوازی عێراقی لە لەندەنو کوردستان. سی ئای ئەی، جۆن ڕێندۆن (John Rendon)ی بەکرێ گرت بۆ ئەوەی کە پڕوپاگەندە دژی سەددام بڵاوبکاتەوە. لەساڵی (1989)دا، جۆن ڕێندۆنو گرووپەکەی دەورێکی سەرەکیان بینی لەدرووستکردنی بنکەیەکی جەماوەریی بۆ پشتگیریی گیەرمۆ ئێندارا (Guillermo Endara) لە هەڵبژاردنی کۆماریی پەنەمادا دژی جەنەراڵ مانوێل نۆرێگا (Manuel Noreiga). بەپێی بووجەی گرووپی ڕێندۆن خۆی، لەماوەی ساڵێکدا (23) ملیۆن دۆلاریان لە پڕوپاگەندە دژی سەددام سەرفکرد. گرووپی ڕاندۆن ناوی کۆنگرەی میللی عێراقی (Iraqi National Congress) لەو بەرە ئۆپۆزیسیۆنە نا کە لەساڵی (1992)دا لەسەرووی عێراق درووستکرا.

سی ئای ئەی دوو ڕێگای گرتەبەر بۆ لابردنی سەددام. یەکەمجار پاڵپشتی (ئای ئێن سی INC) دەکرد کە ئەحمەد چەلەبی سەرکردایەتی دەکرد. ئای ئێن سی ویستی خێراتر لەوەی کە ئەمریکیەکان چاوەڕوانیان دەکرد هەنگاوبنێتو سوپایەکی سەربەخۆی دروستکردو توانی بەشێوەیەکی کاتیی گرووپە کوردییەکان یەکبخات بۆ هێرشکردنە سەر هێزەکانی سەددام. لە کۆتایی ساڵی (1994)دا سی ئای ئەی بنکەیەکیان لە شاری سەلاحەددین کردەوەو کەوتنە ئاڕاستەکردنی چالاکییە سەربازییەکان. بەڵام سەرۆکانی سی ئای ئەیو لێپرسراوانی کۆشکی سپی بەگومانبوون لەوەی کە ئای ئێن سی بتوانێت سەددام لاببات و کۆنترۆڵی کوردەکان بکات. ئەمان بەدیلێکی دیکەیان پێ باشتر بوو بۆیە ڕوویان کردە گرووپی وەفیق.

گرووپی (وەفیق) پێکهاتوە لە دەستەیەک ئەفسەری عێراقیی ڕاکردووکە بنکەکەیان لە عەمانە لە ئەردەن. ئەندامەکانی ئەم گرووپە ئامانجی سەرەکیان ڕێکخستنی کۆدێتایەکە بۆ لابردنی سەددام حسێن. ئەم گرووپە لەلایەن پۆلیسی نهێنی بەریتانییەوە (MI6) پاش شەڕی کەنداو دروستکرا. بەهاری هەمان ساڵ، ئەم گروپە لەلایەن لقی لەندەنی سی ئای ئەی (CIA)یەوە پاڵپشتیی لێکرا کاتێک کە دامودەزگای بوش بۆ ڕێگایەک دەگەڕا بۆ لەناوبردنی سەددام. یەکێک لەسەرۆکەکانی ئەم گرووپە جەنەراڵ (عدنان نوری)ە کە ئامرلیوای پێشووی هێزی تایبەتی سەددام بوو. لە مانگی دووی ساڵی (1992)دا عەدنان نوری بوو بە ئەندامی کۆنگرەی میللی عێراقیی (INC) و چەند مانگێک دوای ئەوە بەنهێنی کرا بەئەندامی ئەو گرووپە بۆ ئەوەی بۆ (CIA) کاربکات. عەدنان نوری بە (ABC News) دەڵێت: "پێیان وتم: تۆ بەجیا لە (INC) کاردەکەیت بەڵام واز لە (INC) مەهێنە. لە مانگی پێنجی ساڵی (1995)دا چەند سەعاتێک پێش دەستپێکردنی هێرشێک بۆ لابردنی سەددام، نوری قەناعەتی بە دامودەزگای کلینتن کرد کە واز لەو کۆدێتایەی (INC) بهێنی کە (CIA) پاڵپشتی دەکرد. ئەو کاتە کلینتن دەمێک بوو گەیشتبووە ئەو قەناعەتەی کە کۆدێتایەک کە لەلایەن ئەندامانی گرووپی وەفیقەوە ڕێکخرابێت چارەسەرێکی باشترە. لەهاوینی ساڵی (1995)ەوە هەموو هەوڵێکی واشنتن لەوەدا کۆببۆیەوە کە لەگەڵ شا حسێنی ئەردەنو ئەفسەرە نوێیەکانی وەفیق لە ئەردەن کاربکات.

کۆشکی سپی کۆدێتایەکی خێرای بەلاوە باش بوو بۆ لابردنی سەددام پێش هەڵبژاردنی (1996)ی سەرەککۆماریی ئەمەریکی، بۆیە سی ئای ئەی کەوتە ڕێکخستنی پلانێک بۆ جێبەجێکردنی کۆدێتایەکە. ئەفسەرەکانی پێشووی سوپای عێراقی کە ئەندامی وەفیق بوون ئەمریکییەکانیان دڵنیا کردەوە کە ئەوان پەیوەندی نزیکیان لەگەڵ خەڵکی پایە بەرز هەیە لە عێراقدا. ئەمانە لەناو عێراق سەددام لادەبەنو دەست بەسەر حوکمدا دەگرن بەبێ ئەوەی دەوڵەتی عێراق تێکبدەن. هەرچەندە هەموو ئەو کۆدێتایانەی کە بەناو دژی سەددام کراون سەرنەکەوتوون، سی ئای ئەی هێشتا هیوای



برینت سکاوکرۆفت



ئەحمەد چەلەبی



وۆرن ماریک

بەرزە. سەرەڕای هەوڵی شا حسێنی ئەردەن بۆ بنیاتنانەوەی پەیوەندی لەگەڵ عێراقدا، گرووپی وەفیق بنکەی هەر لە عەممان مابوو و بەبەردەوامیی پڕوپاگەندە دژی سەددام بەرادیۆ بڵاودەکاتەوەو ئەندامی تازە دەگرێتە خۆی.

وۆرن ماریک (Warren Marik)ی عەمیلی پێشووی سی ئای ئەی لە مانگی نۆی ساڵی (1993)ەوە تا کاتی خانەنشینبوونی لە مانگی یەکی ساڵی (1997)دا، کاری لەگەڵ ئای ئێن سی دەکرد لە سەرووی عێراق. ماریک ئێستاش پێی وایە کە ئەو کارەی (CIA)ی دەیکرد کارێکی راست بوو. ئەگەر رێگای بدرایەو بەبەردەوامی پشتگیری لێبکرایە لەلایەن واشنتۆنەوە، ئەو هەوڵەی سی ئای ئەی نەک هەر سەددامی لادەبرد بەڵکو بارودۆخێکی لەباریشی پێکدەهێنا بۆ دروستبوونی عێراقێکی دیموکراتی. ماریک بە رۆژنامەی (The Washinton Post)ی وت: "کۆشکی سپی و کلینتن سەبریان نەبوو بۆ هەوڵێکی راستییانە بۆ بنیاتنانی دیموکراتیی". لەبری ئەوە، بۆ لابردنی سەددام، ئەوان روویانکردە جەنەراڵەکانی پێشووی عێراق کە دەیان ویست جێی سەددام بگرنەوە. ماریک هیواداره کە، پاش ئەو شکستییەی مانگی نۆی ساڵی (1996)، سی ئای ئەیو کۆشکی سپی ئەو هەڵەیە دووبارەنەکەنەوە.

کلینتن و بوش هەرچەندە لە هەڵبژاردنی کۆماریی ئەمریکیدا دژی یەک بوون، بەڵام هەردووکیان لەوەدا یەکبوون کە دەبێت سەددام لەناوببرێت. بۆیە هەردووکیان لەرێی سی ئای ئەیەوە هەوڵیاندا بۆ ئەنجامدانی ئەو کارە. گیروگرفتی سەرەکیان ئەوە بوو کە هەرچەندە زۆر حەزیان دەکرد سەددام لاببرێت، بەڵام نەیان دەویست هاوسەنگی سیاسیی لەکەنداودا تێک بچێت. یەکێک لە جێگرەکانی سەرۆکی سی ئای ئەی دەڵێت: "سیاسەتی ئێمە ئەوەیە کە سەددام حسێن لاببەین، نەک رژێمەکەی". بۆیە هەموو جارێک کە واشنتن پشتگیری لە مافی مرۆڤو دیموکراتی دەکات لەعێراقدا، ئەوە دووبارە دەکاتەوە کە زۆر گرنگە یەکێتی وڵاتی عێراق بپارێزرێت. ئەوهاوسەنگییەسیاسیەی لەنێوان هێزە بەربەرەکانیکەرەکانی رۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا (تورکیا، عێراق، ئێران، سوریاو سعودیە) هەیە تێکدەچێت ئەگەر عێراق ببێت بە کۆمەڵێک وڵاتی بەئاستەم پێکەوە لێکدراوی میللی فیدراڵی. واشنتن کودێتایەکی پێ باشتر بووە کەلە کۆشکەوە بکرێت وەک لە سەرهەڵدانێکی جەماوەیی بۆ لەناوبردنی سەددام. لەپراکتیکدا ئەمە ئەوەی گەیاندوە کە واشنتن بەرووکەش پشتگیری سەرهەڵدانێکی جەماوەریی کردووە بۆ لەقکردنی رژێمی عێراق، بەڵام لەراستیدا هەموو ئاواتی ئەوە بووە کە یەکێک لەناوەوە (لە کۆشکی سەددامەوە) کارەکە ئەنجام بدات. ئەمە وای کرد کە هەرگیز رقی سیاسەتمەدارانی ئەمریکی لە سەددام نەگاتە ئاستی ترسیان لە دروستبوونی بۆشاییەکی سیاسی لە کەنداودا. لەپاییزی ساڵی (1996)دا، جەنەراڵ برینت سکاوکرۆفت (Brent Scowcroft)، کە راوێژپێکراوبوولەکاروباری ئاسایشیدا، بە (Newsweek)ی گووت: "ئێمە ئەوەمان بۆدەرکەوت کە لابردنی سەددام، هەرچەندە لەسەرەتاوە سەرنجڕاکێش بوو، نە گیروگرفتەکانمان چارەسەردەکات و نە بەرژەوەندیشمان دەپارێزێت. بۆیە ئێمە بەدیلێکی درێژو پیسمان هەڵبژارد، کەزۆرجار لە واقیعدا، تەنیا رێگایە کە لەبەردەستدابێت".

**سیاسەتی ئێمە ئەوەیە کە سەددام حسێن لاببەین، نەک رژێمەکەی**

کاتێک شیعەکان لەخوارووی عێراق لە بەهاری ساڵی (1991)دا، کە لەوەدەچوو ئامادەبن کارەکە تەواوبکەن، لەدژی سەددام راپەڕین، دامودەزگای سەرۆکی ئەوکاتەی ئەمریکا (بوش)، رێگایدا سەددام هێزەکانی کۆبکاتەوەو دەستەوستان تەماشای دەکرد کاتێک سەددام راپەڕینەکەی بە هەلیکۆپتەر دامرکاندەوە. واشنتن لەوە دەترسا کە عێراق بڕوخێت وولاتێکی نوێی ئیسلامیی لەتەنیشت ئێرانەوە دروست بیێت. لە مانگی پێنجی ساڵی (1995)و لە پاییزی ساڵی (1996)دا دامودەزگای کلینتن بەهەمان دودڵییەوە کاریکرد لە سەرووی عێراقدا. بۆ ئەوەی نەبکەوێتە بەرەی ئەو رێکخراوە کوردییانەی کە هاوپەیمانی عێراق یان ئێران بوون ونەیشکەوێتە داوی خەوی کوردستانێکی سەربەخۆوە دامودەزگای کلینتن ئەوەی هەڵبژارد کە هیچ نەکات کاتێک هێزەکانی سەددام هێرشیان کردە سەر ناوچە ئازادەکە (safe haven)و بنکەکانی ئەو ئۆپۆزیسیۆنەیان تێکدا کە سی ئای ئەی پشتگیری دەکرد. چوار رۆژ دوای هێرشی سەددام بۆ سەر شاری هەولێر لە مانگی هەشتی ساڵی (1996)دا، کلینتن بڕیاری دا کە چەند رۆکێتێکی کرووز بدات بە چەند رادارێکدا لە خوارووی عێراق. سەرۆکی وڵاتەکانی کەنداو گەیشتنە ئەو قەناعەتەی کە سیاسەتی ئەمریکی نازانێت بڕیاری چی بدات لە عێراق و سەرۆکەکانی ئەمریکا ئامادەنین یارمەتی هەوپەیمانەکانیان بدەن لە کەنداودا.

**سەرچاوە:**

Randy Stearns:-www ABC News.com.

# هەواڵەکان چی دەگەیەنن ؟ ؟ ؟

ناسر حەفید
14/4/1998

**- ئایا سەوزو زەرد، لەگەڵ سووری "عەلی حەسەن مەجید"دا پەلکەزێڕینەیەک دروست دەکەن بۆ هێنانەوەی سوپاو ئەمن بۆ کوردستان؟**

**- سەرکردەی حیزبەکان بە حوکمی سەرانی بەغداد تاوانبارن، بەڵام ئەم مێژووەی کورد هەرگیز ناتوانێت قازی محەمەدێک دروست بکات.**

**-"ڕۆشنبیران" سکووت بە خۆیان دەکەن، بەڵام ناتوانن دەسەڵاتە دژکارەکانیان ڕووسوور بکەنەوە.**

**-ڕووداوەکانی ئەمڕۆی کوردستان، ئەموەزیان لەسەر هیچ شتێک جێ نەهێشتووە. مەسەلە تێگەشتن نیە، هەڵبژاردنە: لە بەرەی گورگی یان لە بەرەی ئینسان!**

## ئاوڕدانەوەی ئێران لە هێزە کوردییەکان لە ساڵی (1986) ەوە

ئێران دوای ئەوەی بۆی دەرکەوت ناتوانێت لە مەیدانی شەڕەکانی خوارووودا بەسەر عێراقدا زاڵ ببێت، ئاوڕی لە ئۆپۆزیسیۆنی عێراقیی لە کوردستان دایەوە، کە لە پراکتیکدا هەر کوردەکەی دەگرتەوە. ڕۆژنامەی کەیهانی عەرەبیی ئەو زەمانە (ژ:955) نوسیبووی: "*نوقتەیەکی گرنگ هەیە لە هەر کاتێکدا بێت ئابووریی عێراق توشی گیربوون دەکات، ئەویش بریتیە لە هەستانی هێزە ئیسلامیەکان و شۆڕشگێرە کوردە عێراقییەکان بە برینی بۆری نەوتی کەرکوک کە هەموو ڕۆژێک زیاد لە یەک ملیۆن بەرمیل تێدەپەڕێنێت*" (1). ئەمەش ئەوە پیشان دەدات کە ڕێکخراوە کوردییەکان لەو کاتەدا توانیویانە مەبەستی ئێران بهێننە دی.

یەکێتی نیشتیمانیی کوردستان (ینک) تازە لە هەوڵی سەرنەگرتووی خۆڕێکخستن لەگەڵ حکومەتی عێراق گەڕابۆوە. ینک پێش ئەوەی ساڵی 1984 بکەوێتە دانوساندنەوە لە گەڵ عێراقدا، لە شەڕدا بوو دژی هێزەکانی تر: حسک، پاسۆک، حیزبی کۆمۆنیستی عێراق و پارتی دیموکراتی کوردستان (پدک) کە لە بەرەی "جود"دا کۆبوبونەوە. ئاوڕدانەوەی سیاسەتی سەربازیی ئێران لە هێزە کوردییەکان ئەنجامێکی ئەوتۆی نەدەبوو بەبێ ینک کە بەهێزترین هێزی مەیدانەکە بوو. ئەم ئاوەڕدانەوەیەی ستراتیجی سەربازیی ئێران لە توانای هێزە کوردییەکان، بوو بە سەرچاوەی ئیلهامی ئاشتیوونەوەی گشتی. بەڵام بوونی ینک بە مەلوسیی لە ئێراندا دەرنەکەوت تا دەنگوباسی لێدانی موجاهیدین (دوژمنی حکومەتی ئێران) و لێدانی نەوتی کەرکوک بڵاوبۆوە کە دووەمیان بە عەمەلیاتی (فتح)ی یەکەم لە لایەن ئێرانەوە ناوبرا. لە (1986/11/8)دا ڕێکەوتنێک لە نێوانی ینک و پدک دا مۆر کرا. ڕۆژنامەی کەیهانی عەرەبیی (ژ:932) نوسیبووی کە: "*لێپرسراوانی پدک و ینک بە دەسپێشکەریی کۆماری ئیسلامیی و ئامادەبوونی نوێنەری، کۆبونەوەیەکیان کرد و گەیشتنە ئەو ڕێکەوتنە. ئەوەی شایەنی باسە لێپرسراوانی ئەو دوو کۆمەڵە دوای جێبەجێکردنی چالاکییە سەرکەوتووەکانی **کەرکوک** گەیشتنە تاران*" (1).

لە (24-1986/12/27)دا کۆنگرەی "نصرت الشعب العراقي" لە تاران بەسترا. **هاشمی** لە ڕۆژنامەی (الشهادە)ی ژمارە (188)دا دەربارەی ئەم کۆنگرەیە دەڵێت: "*ئامانجی کۆنگرەکە پێکهێنانی بەرەی سیاسی فراوان نیە، بەڵکو کورتەی ئامانجی کۆنگرەکە یەکخستنی مەیدانیی ڕاستەقینەی هەموو لایەنەکانی ئۆپۆزیسیۆنە. وە من دەبێژم کە ئێمە وەکو ئیسلامیی چاوەڕێی لایەنەکانی ترمان دەکرد کە ڕاستگۆیی موعارەزەکردنی ڕژێم و مەبدەئی سیراع بسەلمێنن و بەردەوام بن لەسەر هێڵی بەرەوڕوبونەوە دژی ڕژێمی حاکم لە بەغداد، ئەم گۆڕانەشمان لای هەندێک لایەن دەسکەوت، بەتایبەت لای برا کوردەکانمان لە عەمەلیاتی (الفتح)ی یەکەم و دووەم و هی تردا*" (1).

کەیهانی ژمارە932 نوسیبوی: "*بەڕێز **جەلال تالەبانی** لە چاوپێکەوتنێکدا لەگەڵ محەمەد باقر حەکیمدا باسی دەوری پێشمەرگە کوردەکان و هاوکاریی تەواوی نێوانی ئەوان و هێزە ئیسلامیەکانی کرد کە بووە هۆی زەبرەلێدانێکی گەورە لە ڕژێمی سەددام، هەروەها شانازی خۆی پیشان دا کە ینک لە ڕوانگەی ئیسلامیەوە دژی سوپای عێراق دەجەنگێت*" (1). **ئیدریس بارزانی** لە ژمارە (188)ی ڕۆژنامەی (الشهادە) دا دەربارەی پێویستیی بوونی عولەما لە کوردستاندا دەڵێت: "*بەڵام دەربارەی عولەما دەبێت دڵنیا بن، لە کاتی خواڵیخۆشبوی باوکمدا گرنگی درا بە دروستکردنی یەکێتی عولەما و لەو دواییەدا هەوڵمان دا عولەماکان بخەینە بەردەم مەسئولیاتیانەوە و ئاسانییمان بۆ کردن و هەندێکیان*



وێنەی کچە کوردێکی هەڵەبجە، لە عەرەبانەیەکی گواستنەوەی پڕ لاشەکاندا.

هاتنە سەر ساحە. هەروەها ناوبراو دەڵێت: " ئێە وەکو کورد و وەکو بارزانی بەو شێوەیە دەمارگیریی نەتەوەییمان نیە کە تەنها تەماشای خۆمان بکەین، ئێمە تەماشای تەنگوچەڵەکە دەکەین وەکو تەنگوچەڵەمەی عێراقیی بەگشتی" (1). لە ڕۆژنامەی کەیهانی عەرەبی ژمارە (973)شدا **حوجەت الاسلام النعمانی** ئەوەی دوپات کردەوە کە کۆماری ئیسلامیی یەکێتی ڕیزەکانی ئۆپۆزیسیۆنی عێراقیی خستە سەرشانی خۆی و، هەروەها کوردەکان بە یەکێتیان، داواکارانە لە خەباتگێڕە عێراقیەکان کە بێنە سەر **خەتی ئیمام**، سەرکەوتنێکی گەورەیان بەدەست هێنا (1).
سیاسەتی سەربازیی ئێران دەیویست مەیدانی تری شەڕ بکاتەوە بۆ سوپای عێراق. هێزە کوردییەکانیش بە پێی سروشتی خۆیان لەم موگناتیزەکۆبوونەوە. ئەوەی دەبوو خەڵک بە یەکێتی حیزبەکان ببینێت، گیرسانەوەی هێزەکان بوو لە سیاسەتی ئێراندا. ئەم گیرسانەوەیە بوو بە بنکەیەک بۆ دامەزراندنی بەرەی کوردستانیی. ئەمەش ئەو بەرەیە بوو کە دواتر، دوای ڕاپەڕینی خەڵکی کوردستان، هاتە ناو شارەوەو دەستی گرت بەسەر ڕەوشەکەدا.

## بەکارهێنانی هێزە کوردییەکان لە لایەن ئێرانەوە

بەڵام ئایا کردنەوەی ئەم مەیدانی شەڕە لە کوردستاندا کە ئێران دەیویست فشاری پێ بخاتە سەر سوپای عێراق لە بەرامبەر سوپاکانی خۆیدا لە مەیدانەکانی جەنگدا، چۆن دەکەوێت لەسەر کورد؟
قسەیەک ئێستا بیکەیت بۆ ئەوسا هیچ نرخێکی نیە. بۆیە تەماشای ئەم دەقە بکە کە لە مانگی پێنجی ساڵی 1987دا، بڵاو بووەوە:
(تەنها خستنە سەر ساحەی چەند چەکێکی وەکو ئاڕ.پی.جی و دۆشکەو فڕۆکەشکێن، گۆڕانێکی بینراو لەسەر ساحەی شەڕی کوردستانی عێراق دروست دەکات. قەڵەمبازێک بە شەڕی زیانلێدان دەدات بۆ شەڕی ناوچەگرتن. گرتنی ناوچەکانیش شکاندنی کۆنترۆڵی ڕژێمی چەقۆکێشی بەغدادە. ئایا ڕژێم لەم کاتەدا چی دەکات؟

**سوپا بۆ ئێران و چەکی کیمیاویش بۆ کوردستان**

ئایا عێراق ئەوە دەکات کە ئێران مەبەستێتی؟ ئایا سوپاکەی لە خوارەوە دەگێڕێتەوە بۆ کوردستان؟ لاوازبوونی سوپای عێراق لە بەردەمی ئێراندا یەعنی شکاندنی بڕبڕەی پشتی سەددام. کەواتە سەددام لەبری ئەوەی سەرباز بکشێنێتەوە چەکی کیمیاوی بەکار دەهێنێت. بەچەکی کیمیاویی ئەو شوێنانە پڕ دەکاتەوە کە دەستی ناگاتێ.
**سەددام بۆ مانەوەی خۆی نەک چەکی کیمیاوی، ئەگەر چنگی بکەوێت ئەتۆمییش بەکار دەهێنێت. ئەگەر ئەمان زانیبێت سەددام چەکی کیمیاویی بەکار دەهێنێت، یەعنی ئەمان زانیووە دژی کێ شەڕ دەکەین.**



بەردەوامیی شەڕەکەوگواستنەوەی بۆکوردستان شارو شارۆچکەکانی تریش دەخاتە بەر بۆمبای ڕەشەکوژیی) (2).

دوای نزیکەی ساڵێک، ڕۆژی 1988/3/15 هێزی حیزبەکان و پاسداری ئێران لە سێ لاوە هێرش دەکەنە سەر دەشتی هەڵەبجەو شارەکە دەگرن. لەم هێرشەدا 4000 سەربازی عێراقی بە 25 ئەفسەری گەورەوە بە دیل دەگیرێن. ئەم گرتنەش دەبوو بە ئازادکردن لەقەڵەم بدرێت. ڕۆژی دوایی، (16)ی مانگ، سەعات (11)ی پێش نیوەڕۆ، فڕۆکەکانی عێراق بە گازی کیمیاویی دۆزەخێکیان بۆخەڵکی هەڵەبجەو هەرچی گیانلەبەرێکی تر هەیە، داخست. نزیکەی 5000



کەسیان ڕەشەکوژیی کرد.
ئەوەی کە پێش ساڵێک باسی کوشتارێکی لە بابەتی هەڵەبجە کرا بێت، ئەوە پیشان دەدات کە ئەو کارەساتانەی بەسەر کورد دێن نە غەزەبی خوداوەندن و نە لەسەروو ئەقڵەوەن. ئەوە پیشان دەدات کە ئەو هێزانەی میللەتەکە دای ناوە بیپارێزن، خۆیان بەشێکن لە مەترسییەکە. ئەوە ناگەیەنێت کە سەرانی حیزبەکان نەزان و کەم ئەقڵن. ئێمە نابێت ئەوەندە گەوج بین لامان وابێت سەرکردەی حیزبەکان کە خۆیان ڕووداو دروست دەکەن نازانن ئاکامی ئەوەی دەیکەن چی بەسەر خەڵکێکی وەکو هەڵەبجەو میللەتەکەدا بە گشتیی دەهێنێت. لە قەسفەکەدا ئەوەی توانیبووی خۆی دەرکات، تەنها سەربازی ئێرانیی و پێشمەرگە بووە کە دەمامکی گازی خۆیان پێ بووە (3).

## کورد سیاسەتەکەی لە دەستی بێگانەدا بێت، کارەساتەکانیشی هی خۆی نابێت

سەددام بە کوشتاری هەڵەبجە بە تارانی ڕاگەیاند ئەگەر شەڕەکە نەوەستێنێت گەنجینەکەی ئەم جۆرە چەکەشی تیایە بەکاری بهێنێت دژی شارەکانی ئێران. حکومەتی ئیسلامیی ئێران لەوە تێگەشت کە لەگەڵ ئەو تەکنیکەی پێناکرێت کە وڵاتانی پیشەسازیی "سەددام"یان پێ ڕاگرتووە. ئەم لوتشکانە ئەو سەرە بەرزەی حکومەتی ئیسلامیی دانەواند کە لە گەڵ لێشاوی شۆڕشی ئیسلامییدا لەگەڵ خۆی هێنا بووی و پێشتر ئاوڕی پێ لە هێزە کوردییەکانیش نە دەدایەوە. ئەم بارە تاڵە حکومەتی ئیسلامیی خستە بەردەمی چەند خاڵێک:
1-وەستاندنی شەڕ. خومەینی کە بڕیاری وەستاندنی شەڕەکەی دا وتی: "وەکو ئەوە وایە پەرداخێک ژەهر بخۆمەوە".
2-**بەکارهێنانی هەڵەبجە.** ئێران تا ڕادەیەک سەبووریی شەڕوەستاندنی خۆی بەوە دایەوە کە دەرگا بکاتەوە بۆ جیهان بێن ئەم کارەساتە گەورەیە ببینن. هەڵەبجە، بە پێچەوانەی ئەنفالەوە کە وڵاتێک نەبوو بەکاری بهێنێت بۆ بەرژەوەندی خۆی، لە جیهاندا دەنگی دایەوە. لە ستۆکهۆڵم خۆپیشاندانێکی گەورە ڕێکخرا. لە خۆپیشاندانەکەدا، کاتێک کە دەستەیەک هوتافیان کێشا دژی حکومەتی ئێرانیش، ژمارەیەک ئێرانیی کە دیار بوو سەر بە حکومەتی ئێران بوون، قاوی ئەندامانی لایەنێکیان لێ دان و بوو بە شەڕ. لە ئەوروپا پارەیەکی زۆر کۆکرایەوە بۆشەهیدانی هەڵەبجە، ئەم پارەیە بە کوێ گەیشت؟ کورد دیارە حسابی داناوە خودا بۆی بکات.
3-**پیاچوونەوە.** ئێران دەبێت لەوە بگات کە کلیلی بەهەشت لەملکردن ناتوانێت لەگەڵ تەکنیکدا دەربچێت. ترسێک کەوتە دڵمەوە کە کارەساتی هەڵەبجە بوو بێت بە فیکەی دەسپێکردنی پێشبڕکێ بۆپەیداکردنی چەکی کوشتار. پاش دە ساڵ ڕۆژنامەی الشرق الاوسط، ژمارەی 1998/3/24 دەنوسێت کە واشنتۆن پۆست کەشفی کردووە کە موخابەراتی ڕوسیی چەند ساڵێکە بە نهێنی زانا دەنێرێت بۆ ئێران بۆ مەشق پێکردنی دروستکردنی چەکێک کە 1920 کیلۆمەتر دەڕوات و دەتوانێت نووکی چەکی کوشندە هەڵبگرێت. بەڵام ئەم چەکانە بۆ کورد هەرگیز لەوە خەتر تر نابن کە حیزبەکوردییەکان بەشێکی کوردیی بن لەدامودەزگای وڵاتە داگیرکەرەکانی کوردستان.

## ئێران بە گورگیی بە عێراقی دۆڕاند، بە وڕچییش لە شێرەکەی ناباتەوە

ئەو عێراقەی پەرداخە ژەهرەکەی بە خومەینی خواردەوە، ساڵی 1991 لە بەردەمی ئەمەریکاو هاوپەیمانەکانیدا، لە جەنگی کەنداودا تێک شکێنرا. ئێران دەبێت ئەم تارمایییەشی لەبەرچاو بێت. ئێران بە گورگیی بە عێراقی دۆڕاند، بە وڕچییش لە شێرەکەی ناباتەوە. ئەمەریکاو وڵاتە پیشەسازییەکان خۆیان چەکەکە دروست دەکەن. ئەم جۆرە وڵاتەش تا ئەو نوقتەیە دەتوانن لە چەکدارییدا بەرز ببنەوە کە سەریان بگاتە ئاستی بۆکزی ئەمەریکاو تاقمەکەی.
ئێران هەمیشە پێی خۆشە کە UN ئەو چەکانە نەهێڵێت کە پەرداخە ژەهرەکەی بە خومەینی خواردەوە. بەڵام هەر کاتێک تازە چەقەڵەکە خۆی لە بڕیارەکانی UN کێف دەکاتەوە، جگە لە چەکەکان بوونی ئەمەریکا لە ناوچەکەدا بەهێز دەکات، ئەوەی کە ئێران پێی نیگەرانە. سەرکۆماری ئێران **موحەمەد خاتەمیی** لە مانگی دووی ئەمساڵدا دەڵێت: "*هێزەکانی بێگانە بونەتە هۆی گرژیی لە ناوچەکەدا، مانەوەیان ئیهانەیە بۆ وڵاتانی ناوچەکە*. هەروەها دەڵێت: "*ئێمە بە توندیی ناڕەزایی خۆمان دەردەبڕین بەرامبەر هەر هێرشێک دژی عێراق کە دەتوانێت زیان بە گەلی عێراقیی بگەیەنێت، بەڵام ئاگاداری حکومەتی عێراقیش دەکەینەوە کە خۆی ڕاست بکاتەوە لەگەڵ هەموو یاساو بڕیارە جیهانییەکاندا*" (4).
ئێران نایەوێت چەقەڵەکە شێرەکەی لێ نزیک بکاتەوە. (سەددام)یش بە هێشتنەوەی ئەمەریکا لە ناوچەکەدا دەتوانێت لاوازیی خۆی بشارێتەوەو گەرەنتی خۆی لە بەرامبەر کۆنە دوژمنەکەیدا (ئێران)

**خەڵکەکەش بەرپرسیارە لەوەی شتێکی بەسەردا تێپەڕ نەبێت خۆی هەڵی نەبژاردبێت**

بکات.
ئێران ناتوانێت ڕاستەوخۆ بەرامبەر بە ئەمەریکا بوەستێتەوە، بەڵام هەوڵ دەدات بیانوەکانی ئەمەریکا لە ناوچەکەدا نەهێڵێت و دژی ئیشەکانی بجوڵێتەوە. بۆ نمونە ڕۆژی 1996/8/31، کاتێک پدک سوپای عێراق دەهێنێتەوە هەولێر، (ینک)یش بەلایەنی کەمەوە بە دەسبەرداریی ئێران کوردستان چۆڵ دەکات و ئیتر ناوچەی پارێزراو کە بۆ پاراستنی خەڵکی کورد لە ڕژێمی سەددام لە لایەن وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکاو بەریتانیاو فەرەنساو تورکیاوە دامەزرابوو، مانای نامێنێت. یەکێکیان دەچێت سوپای عێراق دەهێنێتەوەو ئەوی تریشیان ڕێگای بۆ چۆڵ دەکات و نای پارێزێت. بەم پێیە لەم زەمان و شوێنەدا، بە بەکارهێنانی حیزبەکان کە تاکە دەستیاون بۆ ئەم مەبەستە، کێشەی کورد کارەکتەری سیاسیی لێ دەسەنرێتەوە.

## کێچە حیزبەکان جوڵانەوەی وڵاتە دەستێخەرەکانیان پیشان دەدەن




کوڤاری "الوسط" ی (1998/1/26) دەنوسێت دوای هێرشی (14)ی مانگی پێنجی پاری سوپای تورکیی، تاڵەبانی بە ناردنی وەفدێک بە سەرۆکایەتی ئەندامی لیژنەی مەرکەزیی **عیماد ئەحمەد** بۆ بەغداد، پەیوەندیی لەگەڵ عێراقدا دروست دەکات. تاڵەبانی نامەیەکی زارەکی لە بەغدادەوە وەردەگرێت کە داوای هەوڵی فەشەل پێکردنی هێرشی تورکیی لێ دەکرێت. بەپێی "الوسط" تاڵەبانی بەهەڵی زانیووە کە داوای یارمەتی لە عێراق بکات و بەغدادیش هەست بەوە دەکات کە دەتوانێت بە ڕاکێشانی کوردەکان بۆ ڕێکەوتنێکی سیاسی زیان لە بەرژوەندی ئەمەریکیی بدات. بۆیە داوای لە تاڵەبانی کردوە کە هاریکاریی خۆی لەگەڵ ئۆپۆزیسیۆنی عێراقی بەتایبەتی "کۆنگرەی نیشتیمانی" کە بەغداد تاوانباری دەکات بە هاوکاریی لەگەڵ ئیسخباراتی مەرکزیی ئەمەریکییدا، نەهێڵێت. بەپێی "الوسط" تاڵەبانی داواکەی عێراقی ڕەت نەکردۆتەوەو کەسانی کۆنگرەو چەکدارانی لە سلێمانی دەرکردوەو بەغدادیش پاداشتی ئەمەی بە ناردنی چەکی سووک و مامناوەندی داوەتەوە کە بە گوێرەی "الوسط" لە (12)ی ئۆکتۆبەری پاردا هێرشی پێ کردۆتە سەر پدک. هەروەها "الوسط" دەنوسێت کە دواتر تاڵەبانی، دوای هاتنە ژوورەوەی سوپای تورکیی لە (24)ی ئەیلولی پاردا، وەفدێکی مەکتەبی سیاسی بەسەرۆکایەتی **ئەرسەلان بایز** دەنێرێت بۆ بەغداد، کە ئەو کاتە نوێنەری پدک بە سەرۆکایەتی سامی ئەوڕوحمان لە بەغداد دەبێت و بەغدادیش لە هەوڵی شەڕوەستاندنی نێوان کوردەکاندا دەبێت وەکو سەرەتای گفتوگۆیەک بۆ گەیشتن بە ڕێکەوتنێک لە سەر بناغەی ئەو پرۆژەی ئۆتۆنۆمییەی کە بەغداد لە سالی (1991)دا خستیە بەردەمی حیزبەکان و ئەوان ڕەتیان کردەوە. هەروەها بە پێی هەمان گۆڤار لە (2)ی ئۆکتۆبەری پاردا نوێنەری تاڵەبانی، بۆ ڕێکەوتن لەگەڵ بارزانی لە سایەی چاودێریی عێراقدا، ئامادەیی خۆی پیشان داوە کە هەوڵی خۆی یەک بخات بۆ قسەکردن لە گەڵ بەغداد. بۆیە ئەو نامەیەی کە سکرتێری ینک لە ڕۆژی (1997/12/31)دا بۆ سەرۆکی "پدک"ی دەنوسێت وەکو شیعر بۆی نەهاتوەو تەنها لەسەر زەوی لای کوردەکە خۆی کتوپڕییە. دەنا حیزبەکان وەکو کێچێک هەمیشە سیاسەتی ئەو وڵاتانە پیشان دەدەن کە دەستیان تێ خستوون.
تێکستی تەلەفیزیۆنی سویدیی، ڕۆژی 98/2/12 لە ژێر ناونیشانی (هەڕەشەی ئەمەریکا عێراق لە ئێران نزیک دەکاتەوە)دا نوسیبوی کە سەرۆکی دەزگای جاسوسیی هەردوو وڵات (ئێران و عێراق) کۆبوونەوەیان کردووە بۆ ئەوەی چالاکیەکانیان بەیەکەوە ڕێکبخەن. تێکستەکە دەستی ڕاکێشاوە بۆ ڕۆژنامەی The Times کە ئەوە پیشان دەدات حکومەتی عێراق پشتگیریی گروپە ئۆپۆزیسیۆنەکانی ئێرانی کەم کردبێتەوەو ئێرانیش داواکردنی 100 ملیارد دۆلار خەسارەی جەنگەکەی سالانی (1980)ی لەسەر عێراق لابردبێت. بە پێی هەمان تەلەفیزیۆن کە ڕۆژی دوایی نوسیبووی هەر (12)ی مانگ هەردوو گروپە خەنیمەکەی یەکتریی (پدک و ینک) ڕێک دەکەون بۆ درێژکردنەوەی ئەو شەڕوەستانەی کە لە مانگی دوانزەدا دەستی پێ کردووە، هەروەها ئەودیلی شەڕانەی کە لای یەکتریی هەیانە بەربدرێن.
**ئێلاینە سیۆلینۆ** دەنوسێت کە ئێران و عێراق لە دوای جەنگەکەیانەوە تا ڕادەیەکی زۆر خۆیان لە یەکتریی پاراستووەو نوێنەری ڕەسمی ئێران چەند جارێک ئەوەی دووبارە کردۆتەوە کە دەبێت کیانی عێراق بپارێزرێت. هەروەها ناوبراو باسی ئەو دەکات کە لە کاتێکدا کە هەندێک لە ئەمەریکییەکان داوای ڕووخانی سەددامیان کردوە، کەسانی ئێرانیەکان خۆیان لەم جۆرە توندوتیژییە پاراستووە (4).
تێکستی (CNN) ی ڕۆژی 1998/3/22 دەنوسێت کە ئەو دوو حیزبە خەنیمەی یەکتریی کە لە شەڕدان لەسەر کۆنترۆڵی ناوچەکە، لە لایەن عێراقەوە دەعوەت کران بۆ حلکردنی ناکۆکی نێوانیان بە برایانە، بە یارمەتی بەغداد. تێکستەکە دەنوسێت کە یەکێک لە ڕۆژنامە گەورەکان، کە عودەی کوڕی سەددام خاوەنێتی، داوای بەستنی کۆنفرانسێکی نیشتیمانی دەکات بۆ حلکردنی ئەو وەزعە. ڕۆژنامەکە دەڵێت: *"ئێمە ئاگاداری پارتە کوردییەکان دەکەینەوە کە لەژێر فشاری هێزێکی دەوەوەدا ئەم داوا* ڕەسمییە کراوەیەی حکومەت بۆ گفتوگۆ ڕەت نەکەنەوە".

## ئەم مێژووە ناتوانێت قازی محەمەد دروست بکات

حیزبەکان کۆتایی سالانی هەشتاکان ئێران لە جەنگەکەیدا دژی سەددام بەکاری هێنان و ئاکامەکەی بە هەڵەبجەو ئەنفال شکایەوە. سالی 1991، لە کاتێکدا ڕۆژی 1000 منالەکورد لەسەر سنوور دەمرد،

سەرکردەکانیان بە تۆپەڵ چون بۆ لای سەددام وئاکامەکەی هێنانەوەی کێشەی جیهانیی کورد بوو بۆ بەردەمی جەلادەکانی. ساڵی 1992 پەرلەمانێکی کارتۆنییان بە خەڵکەکە هەڵبژاردو ئاکامەکەی نەهێشتنی ئەڵتەرناتیڤێکی سیاسی تروسووکردنی دامودەزگای دیموکراتی بوو. ساڵی 1994 شەڕی ناوخۆیان دەست پێ کردو ئاکامەکەی جگە لە وێرانکردنی کوردستان و بەکوشتدانی چەندەها لاوی کوردو ماڵوێرانیی بۆ کەسوکاریان، ئەوەیان پیشانی جیهان دا کە کورد دوورە لەوەی لە ڕوانگەیەکی سیاسییەوە تەماشای بکرێت. ساڵی 1996 سوپای سەددامیان هێنایەوە بۆ هەولێروئاکامەکەی هەڵدڕینی زۆنی پارێزراوبوو لە ڕوی سیاسیەوە. لەم ڕێڕەوەوە وا دێتە بەرچاو کە:

ئەمقەستەی دەمداخستنی شەڕی ناوخۆی کوردکوشتنەو دەمکردنەوەی یەکگرتنی بۆ لێدانی مەسەلەی کوردە، ئێستا ئەرکێک لە مێژووەکەیدا لەبەردەمیدا وەستا بێت هێنانەوەی حکومەتی عێراقە بۆ کوردستان. بەڵام ئایا سەرانی بەغداد ئەم قۆنتەراتەیان دەدەنێ؟ لە حاڵەتێکدا بەغدادی سەددام ناچار بێت ئاوڕ لەم هێزانە بداتەوە، ئەوەی دەمێنێتەوە گفتوگۆی لەسەر بکرێت چۆنیەتی هێنانەوەیەتی، چ شانۆیەکی بۆ دەگێڕن، یان لە ژێر کام پەردەدا جێبەجێی دەکەن؟ شەڕی ناوخۆ دەخەنە شارەکانەوەو سوپای عێراق بۆ گێڕانەوەی ئاسایش دێتەوە؟ یان (43) ی مانگ بەیانێک دەخوێنرێتەوە؟ ئەوەی کە وەڵامی تەواوی لایەو دەتوانێت وێنەی ڕاستییەکەمان پیشان بدات کاتە. بەڵام دەوێرم پەنجە بۆ هەندێک بۆچوون ڕابکێشم کە ئەگەر ڕاست بن، ڕۆڵی خۆیان لە پرۆسێسەکاندا دەبینن:

1-سەددام وەکو لایەنی سیاسی حساب بۆ حیزبەکان ناکات و عەلی حەسەن مەجید بۆ ئەوە لەگەڵیان کۆنابێتەوە بەیانێک یان خاڵێکیان بداتێ تا پایەیەکی سیاسی لەناو خەڵکدا پێ وەربگرن.

2-حیزبەکان بە پێی سروشتی خۆیان کە حیزبی سیاسی نین، هێزی کوردیان پێ نیە بتوانن بەرامبەر بە حکومەتی مەرکەزیی بەکاری بهێنن. لە حاڵەتێکدا ئەو وڵاتانەی دەستیان تێ خستوون لەگەڵ حکومەتی عێراقدا یەکبن بۆ گێڕانەوەی هێزی حکومەت، حیزبەکان ڕێگایەکی تر کە هەیان بێت، ئاشبەتاڵە.

3-ئەوەی کە حیزبەکان بتوانن سەوداکاریی لەسەر بکەن، ترسی ڕاپەڕینی خەڵکەکەیە کە لە پێشەوە ئیشی بۆ کراوەو پیشانیان داوە کە شکاندنی دەرگایەک کردنەوەی دەرگایەکە بۆ بەردەمی دەرگایەکی داخراوی تر. جگە لەوەش ئەو هێزی جاشانەی کە حکومەتی عێراقییان گۆڕییەوە بە حیزبەکان، دەتوانرێن بەکار بهێنرێنەوە بۆ پێچەوانەکەی.

4- حکومەتی بەغداد لە بارێکی مێژوویی وادایە کە چارەی کێشەی کوردەکەی خۆی لەگەڵ وڵاتەکانی تری ناوچەکەدا دەکات نەک لەگەڵ کوردەکە خۆی. ئەو وڵاتانەی دەستیان لە هێزەکاندایە، دەتوانن دەست بەرداریی ئەو دوو هێزە گەورەیە بن و دەفتەری مەسەلەی کوردیان لە باشووری کوردستاندا پێ دابخەن.

5-سەرانی حیزبەکان لەبەردەمی سەرانی "بەغداد" دا تاوانبارن بە دەستێکەڵاوییان لەگەڵ بێگانە. هەرچەندە حیزبەکان باسی یەکێتی خاکی عێراق دەکەن، بەڵام هەرگیز لای سەرانی "بەغداد" جێگای متمانە نین کە ڕۆژێک لە لایەن وڵاتانەوە دژی حکومەتی بەغداد بەکار نەهێنرێن. ئاوەکە بەرەو تەنکیی بڕوات ماسیە گەورەکانیش دێنەوە بەر لوتی تیمساحەکە: عەلی حەسەن مەجید. بەڵام، مێژوویەک بەرهەمەکەی خیانەت بێت، هەرگیز ناتوانێت "قازی محەمەد"ێک دروست بکات.

## دە ساڵ دوای هەڵەبجە قوربانییەکان هەر قوربانین و تاوانکارەکانیش هەر تاوانکار

**کریستین گۆسدن** دەنوسێت: "هەڵەبجە بە گەورەترین میقداری گازی شەڕ، کە دژی خەڵکی مەدەنی بەکار هاتبێت، بۆمباران کراوە. کیمیاوییەکە بریتی بووە لە تێکەڵەی گازی سێناب، سارین، تابون و VX. سێناب کاردەکاتە سەر پێست، چاو و پەردەی کەناڵەکانی قوڕگ و سی. سیانەکەی تریشیان کار دەکەنە سەر ئەعساب. ئەم تێکەڵەیە بەهاری 1988 پێست و لەشی خەڵکەکەی هەڵەبجەی بەیەکەوە نوساند، لە بۆری هەناسەو مێشک و چاوی دان و خواردن و ئاوو دەورووبەرەکەی ژەهراویی کردن" (6).

**واینە رۆبەرتس** ساڵی 1997 دەچێتەوە هەڵەبجەو فلیمێک بە ناوی "بای مردن" دەردەکات. **کریستین گۆسدن** کە پرۆفیسۆرە

---

**کریستین گۆسدن:**

**- بەهاری 1988 تێکەڵەی گاز، پێست و لەشی خەڵکی هەڵەبجەی بەیەکەوە نوساند، لە بۆری هەناسەو مێشک و چاوی دان و خواردن و ئاوی ژەهراویی کردن.**

**-دەردێکیان توش بووە کە هەرگیز پێشتر نەبینراوەو ڕاپۆرتی لەسەر نەدراوە.**

**-زۆربەیان پارەیان نیە بۆ هەرزانترین چارەسەر یاخود دەرمان.**

---



له جەنەتیک دا دەڵێت: "وابنە قەناعەتی پێ کردم کە ناچارم بچم بۆ هەڵەبجە". گۆسدن کە بە پێی زانستەکەی لە ئیفلیجیی زگماکی و نەزۆکیی و کانسەری سنگ، ڕەحم و ڕیخۆڵە دەکۆڵێتەوە، بۆ ئەم سەفەرە یەکاویەک دەبێت. گۆسدن دەڵێت: "یەکەم جار بوو کە چەکێکی کیمیاوی لە تێکەڵەیەکی وا پیس دژی دانیشتوانێکی وا گەورەی مەدەنی بەکار بێت. بێ ئارامیی ئەوە گرتبوومی کە سەقەتیی، نەزۆکیی و هەروەها کانسەر، نەک تەنها لە منداڵ و ژن بەڵکو لای هەموو دانیشتوانەکە دەرکەوتبێت. هەروەها لەوە دەترسام کە کاریگەریی تری درێژخایەنی وەکو کوێریی و عەسەبیی هەبێت کە هیچ چارەسەرێکی زانراویان نەبێت"(6). خاتوو گۆسدن دەڵێت: "ئەوەی چاوم پێی کەوت لەو ترسە گەورەیەش زیاتر بوو کە هەم بوو. کیمیاوییەکان بەشێوەیەکی گران کاریان کردۆتە سەر چاو، بۆری هەوا و سیستێمی ئەعساب. زۆر کەس کوێر بوون. زۆر کەس لە ژێر ئازاری پێستدا دەژین کە دەبێت بە کانسەر".

بە پێی گۆسدن دوای دە ساڵ، نەخۆشیی وەکو ئیفلیجیی، نەزۆکیی و کانسەر لە ناوچەی هەڵەبجەدا بە لایەنی کەمەوە 3 تا 4 جار زیاترە لە شارێکی تری هەمان ناوچە. ژمارەی مردنی منداڵ بە لیۆکیمی (کانسەری خوێن) هەموو ساڵێک لە زیاد بووندایە. کانسەرەکە لە هەڵەبجە بە گوێرەی شوێنەکانی تر، لە خەڵکێکی زۆر گەنج دەردەکەوێت و زۆر کەس توشی گرێی کانسەری پلەی خراپ دەبن و مردن زۆر زۆرە.

گۆسدن دەڵێت: "ئەو ئاکامە نەخۆشیە ئەعسابانە لە کارەساتی مرۆڤەکاندا لە هەموو جادەیەکدا، تا ڕادەیەک لە هەموو ماڵێکدا و لە هەموو بەشەکانی خەستەخانەکانیشدا دەبینرێت. خەڵکانێک دەگرین و بە هۆی پەستییەکی توندەوە هەڵدەچن و دوکتۆرەکان دەبێت زۆر جار خەریکی ئەوە بن گوللە لەو کەسانە دەربهێنن کە هەوڵی خۆکوشتنیان داوەو سەری نەگرتووە". هەروەها دەڵێت: "زۆربەیان پارەیان نیە تەنانەت بۆ هەرزانترین چارەسەر یاخود دەرمان و بۆیە دوودڵ دەبن لە چونە خەستەخانە. هەروەها دەڵێت: لە ڕۆژی یەکەمدا لە بەشی منداڵبوونی خەستەخانە، هیچ ژنێک ئاسایی منداڵی نەبوو بوو، هەروەها هیچ ژنێک لەو ڕۆژانەدا منداڵێکی ساغی نەخستبۆوە. سێ ژن تازە منداڵیان لەبارچووبوو. فەرمانبەرەکان باسیان کرد کە ڕێژەیەکی زۆر گەورەی ئەو منداڵانەی لە دایک بوون سەقەت بوون".

بە پێی کریستین گۆسدن، لە هەڵەبجە منداڵ لەبارچوون و ساوامردن چوار جار زیاترە لە سلێمانی و ئەم سەقەتییە زگماکییە جینکارانەی لەو منداڵانە دەردەکەون کە پاش چەندەها ساڵ دوای بەکارهێنانی چەکی کیمیاویی لە دایک دەبن، ئەوە پیشان دەدەن کە کاریگەریی چەکە کیمیاوییەکە بەردەوام دەبێت بۆ نەوەکانی داهاتوش. ئەم حاڵەتانەی کانسەر و تەفرەی جین کە لەو گروپەدا دەرکەوتوون، دەتوانرێت بەراورد بکرێت لە گەڵ ئەو حاڵەتەی کە لە دوو کیلۆمەتر دوور لە "هیرۆشیما" و "ناکازاکی"وە هەبووەو ئەوە پیشان دەدەن کە ئەو کیمیاوایانەی بەکارهاتووە لەسەروو هەموویانەوە گازی سێناب، کاریگەرییەکی گشتی هەیە لەسەر لەش کە دەتوانرێت بەراوورد بکرێت لەگەڵ ئەو کاریگەرییەی کە تیشکدانی چەکی ئەتۆمیی لە دوای خۆی بەجێی دێڵێت.

کریستین گۆسمان دەڵێت ئەو خەڵکانە لە هەڵەبجە بە زووترین کات پێویستییان بە یارمەتی هەیە. پێویستییان بە دوکتۆری تایبەتی و دەستیاو و دەرمانە. هەروەها لەمەش بنچینەیی تر؛ پێویستیی گەرمیی، ئاوی پاک و خەباتی چاودێریکەرانەیە بۆ پارێزگاریی کردنیان لە هێرشی تر. ناوبراو دەڵێت: "دەبێت ئەوە بزانین کە زانیارییەکی پزیشکیی یاخود زانستیی زۆر کەم هەیە بۆ چارەسەرکردنی قوربانیەکانی دوای هێرشێک بەم جۆرە چەکەی گازی شەڕ. زۆر لەم مرۆڤانە بەر تێکەڵەیەکی نا ئاسایی گازی ژەهراویی کەوتوون. دەردێکیان تووش بووە هەرگیز پێشتر نەبینراوەو ڕاپۆرتی لەسەر نەدراوە.

## "ڕابوون" چۆن ئەم کەروێشکە زلەی لە ناوکەڵەوە دەرچوو؟



دە ساڵ دوای بۆمبابارانی هەڵەبجە تەنها کانسەرو نوقسانیی و ئەشکەنجەی قوربانیەکانی هەڵەبجە نیە کە بەردەوامن. کورد تازە حیزبەکانی، بە چەکی بەغداد کوردی تر دەکوژن و عەلی حەسەن مەجید بانگی سولحیان بۆ دەدات. دە ساڵ دوای هەڵەبجە، بە ئەنفال و ئیعدام و ڕاپەڕین و ڕەوەوە هەر کانسەری حیزبەکان نیە، ئیفلیجیی "کولتوریی"ش بەردەوامە؛ "ڕۆشنبیران" (وەکو ئەو خەڵکەی تر کوێرایی داهاتبێت) هەندێکیان بۆ تاوانی حیزبەکان بێ دەنگ دەبن و هەندێکیشیان لە دژی لایەکیان لە ڕقی شەخسی، یان لە دەرەوەی مۆراڵ و پرەنسیپی ئینسانییەوە بۆ لایەکەی تریان کۆدەبنەوە. **شێرکۆ بێکەس** بە فەردەیەک دیوان و هاوارەوە دەنگی خۆی دەخاتە پاڵ هێزێکی ئەم سیستێمی دەسەڵاتە. گۆڤاری **"ڕابوون"** بەم ناوە زلەوە کە کوردستانی بە کۆڵۆنی لەقەڵەم داوەو سەرنوسەرەکەشی **"ڕەفیق سابیر**، "نێچیرەوان" بە "عودەی" کوڕی سەددام و "کولان" بە دەزگای "بابل" دەچوێنێت، کەچی یەکێک لە ئەندامانی دەستەی نووسەرانی گۆڤارەکە **"کاروان عەبدوڵا"** دەبێت بە سەرنووسەری بڵاوکراوەیەکی دەزگای ئەو "کولان"ەو سەرنووسەرەکەشی "ڕەفیق سابیر"دیوانە تازەکەی "ژوانی ڕوناکیی" لەم دەزگایەدا ژمارە"11" ی پێ دەبرێت. "ڕابوون" چۆن ئەم کەروێشکە زلەی لەناو کەڵەوە دەرچوو؟ لە کاتێکدا کە **"ئیسمائیل**



سەربازی تورکیی وێنە بە کوردی کوژراوەوە دەگرن و بە پێکەنینەوە گوێچکەی یەکێکیان دەبڕنەوە.

بێشکچی" کە نووسەرێکی تورکە، لەسەر کورد لە بەندیخانەی "حکومەتی تورکیا" دایە، "ڕۆشنبیران" ی کورد لە دەرباری هێزێکدا دەفکرن و ژان دەیان گرێت کە لە پێش سوپای ئەم حکومەتەوە دەڕوات کە وێنە بە سەری براوی ئینسانەوە دەگرێت.
"ڕۆشنبیران" ی ئەندامانی ئەو پەڕلەمانەی کە خەڵکی دەنگیان بۆ دا، لەوانە **"حوسەین عارف"** ی چیرۆکنووس، نەبیستران دەنگی وازهێنانیان لە بەرامبەر کارتۆنیی ئەو پەڕلەماندا بەرز ببێتەوە. لە کاتێکدا کە دەسەڵاتی سیستیمی حیزبەکان میللەتەکەیان بۆ ناهەمواریی دەبرد، ئەمانە چییان لە متمانەی خەڵکیی کرد؟
میللەتێک نووسەرەکانی لە بەردەمی خەڵکییدا قەرزاربارن بەوەی ڕوونکردنەوەیان هەبێت بۆ ئەوەی کە چۆن کردارو هەڵوێستیان لە لایەک و نوسین و هۆنراوەکانیان لە لایەکی ترەوە یەک دەخەنەوە.
ئەو پەتە موراڵییە کامەیە کە بۆ نمونە:
-شێرکۆ بێکەس دەتوانێت بە سەرێکی لە هێزی سەوزدا بێت و بە سەرەکەی تری هاواری ئازادیی و مافی مرۆڤمان بۆ بکات؟
-ڕەفیق سابیر دەتوانێت بە سەرێکی "کاروان عەبدوڵا" سەرنووسەری گۆڤارێکی دەزگای گوڵان بێت و دیوانێکی خۆشی لە لیستەی ئەم دەزگایەدا ژمارە 11 بێت و، بە سەرەکەی تریان لاوکی هەڵەبجە بهۆنێتەوەو "نێچیر" بە "عودەی" و "گوڵان" بە "بابل" بچوێنێت وکوردستانیش کۆڵۆنی بیت؟
لە ناو میللەتی بێ کۆنتراکتدا نوسەرانی قسە بۆ مردوو دەکەن. گرنگ نیە لە لایەکەوە باسی ئازادیی و هەژارو نیشتیمان و پەپوولەی بۆ بکەن و لە لایەکی ترەوە لەسەر ئەو جەستانە بنیشنەوە کە دەسەڵاتەکان، خامۆش دەنگیان لێ بڕیوون.
ساڵی 1975 جولانەوەیەکی 14ساڵیی ئاشبەتاڵی پێ کرا. میللەتێک لەو سەرەوە هاتەوەو وتی: مەلا مستەفا بوو. ئەمە ڕاستە، مەلا مستەفا بڕیاری بڵاوەپێکردنی جولانەوەکەی دا، بەڵام هەموو ئەندامانی بەشدارن لە پێکهێنانی جولانەوەیەکدا کە بە بڕیاری سەرکردەکەی ئاشبەتاڵی پێ بکات. پرسیارەکە هەر ئەوە نیە کە مەلا مستەفا بۆ ئاشبەتاڵی بە جولانەوەکە کرد، بەڵکو ئەوەشە ئەی جولانەوەکە بۆ بە بڕیاری تاکە کەسێکی ئاشبەتاڵی لێ کرد؟

**لەبەردەمی ئەوەدا کە میللەتێک لە کۆنتراکتێکدا خۆی ڕێک بخاتەوە، تەنها ئەوە نیە کە دەسەڵاتە سیاسیەکەی دەبێت لەگەڵ ئەو گفتەدا لاچێت کە نای باتە سەر، تەنها نووسەرو ناسراوەکانی نیە کە دەبێت بەتەواوی خۆیان ساخ بکەنەوەو قسەو کرداریان یەک شت بڵێت، بەڵکو خەڵکەکەش بەرپرسیارە لەوەی کە قبوڵی نەکات ناهەقیی و درۆی لەگەڵدا بکرێت.**
ڕوداوەکانی ئەمڕۆی کوردستان تەمومژیان لەسەر هیچ شتێک نەهێشتۆتەوە. هیچ کەسێک لەو سەرەوە نەیەتەوەو بڵێت مەسعود بارزانی خێڵەکیی، یان جەلال تاڵەبانی دیکتاتۆر بوو. کارەساتەکان نە ئەوەن کەس بتوانێت چاویان لێ بنوقێنێت، نە ئەوەشن چاوپۆشیی لە هەڵەو داخزانی یەکتریی بکەین. ئەوەی بەشداریی دەکات لە فرۆشتنی مەسەلەی میللەتدا، ڕێزیشی دانەناوە بۆ تۆش کە ئەندامێکی تیادا. دەسەڵاتێک ڕێزی نەبێت بۆ خەڵک، بێ ڕێزیی خۆتە وەڵامت نەبێت بۆی.
عودەی کوڕی سەددام حوسەین لە سەرەتای ئەم مانگەدا، دوای ئەم هەموو کارەسات و تاوانەی بەسەر عێراقیان هێناوە، هێشتا ئەو ئەمنستی دەردەکات بۆ ڕۆژنامەنووسەکان بێنەوە بە ئازادیی لەسەر عەرشەکەی بنووسن. "ڕۆشنبیران" دەبێت لە خۆیان بپرسن لە دەرباری ئەم عەرشانەدا کە دەبێت چاو لە بابەتی هەڵەبجەو ئەنفال بپۆشن کە زیندەبەچاڵی خۆیانن، ئیتر جگە لە بەشداریی لە تاواندا، چی تر دەمێنێتەوە بی نووسن؟
"ڕۆشنبیران" دەتوانن کەژاوەی دەسەڵاتدارەکان بە شیعرو پەخشان و شانامە برازێننەوە، بەڵام بەشدارییان سکووت بە خۆیان دەکات و ناتوانێت ڕوسووریی بهێنێتەوە بۆ ئەوان. کام وشە قەبەو ڕەنگاوڕەنگە، بێ موراڵیی نوسەرەکەی دەتوانێت بەتاڵی بکاتەوەو بیخاتە تەنەکەی خۆڵەوە! ئەمەش سزای نوسەرێکی دووسەرە نیە کە کردارو قسەی پێچەوانەی یەکتریی بن، بەڵکو لە دنیای کۆنتراکتدا



وێنەی ژنەکوردێکی ڕەوەکە، جگە لە پشکۆکەی دڵی، لەو منداڵەی لە چاڵی ناوە تەنها ڕەسمێکی بە دەستەوە ماوە

ئەدیب لەگەڵ منداڵەکە دەچێتە چاڵەوە، لەگەڵ دایکەکە هەڵ دەپڕوکێت، لە ژێر دەستی ئەو کوڕەدا بۆنی خۆڵەکە دەگرێت. لە سەر ئەم لوتکەیەوە بینینەکان و ڕامانی کەسەکان لە بەرهەمی ئەدەبییدا دەچنێت. کاتێک جەستە بێ گوناحەکان دەکوژێنەوە، بەرهەمێک دادەگیرسێت بۆ ئەوەی ڕۆحەکان هەر زیندوو بن. ئەدیب لێرەدا لە دایک دەبێت، یان لێرەدا پشت دەکاتە ئەم ڕووداوانەو دەمرێت.
ئەوانەی لە دەرباری دەسەڵاتە دژکارەکاندا ژان دەیان گرێت، کەم بڵێن یان زۆر، پەمەیی بنووسن یان شینی ئاسمانیی، هەر مێژوویەکی شەرمەزاریی پێ دەوڵەمەند دەکەن و جێگای گومانە ئەدەب بێت.
مێژووەکە تەنها کۆتایی بە کارەکتەری سیاسی دەسەڵاتدارەکانی نەهێناوە، نووسەرو هونەرمەکانیشی لەگەڵ خۆیدا ڕاپێچ دەکات. بۆیە ئاساییە نوێنەرانی ئەو کولتورەی کە هێزە دژکارەکانیشی لێ دروست بوون، لە بەرامبەر وەرچەرخانێکی مێژووییدا، لە یەک بەرەدا کۆ ببنەوە.

---

بەرپرسیاریی هەر یەکێکە کە ئامادە نەبێت گوێ لە درۆ بگرێت و یاری بە هەستی بکرێت.
ئێمە هەرگیز ناتوانین ئەوە ساخ بکەینەوە کە ئەو کارەساتانەی ڕوو دەدەن لەبەر بەدیی خراپکارانە یان لەبەر بێ هەڵوێستیی ئێمە. چونکە هەمیشە نیوەی ئەوەی دێتە کایەوە لایەنەکەی تر بڕیاری لەسەر دەدات. نووسەرانی بەرەی کۆنتراکت، ئەرکی سەر شانیانە کە دیاردەو ڕووداوەکان شی بکەنەوەو پیشانی خەڵکەکەی بدەن. بە لایەنی کەمەوە بۆ ئەوەی بزانرێت کامانەن ئەوانەی پێویستە بەریان لێ بگیرێت و بەسەر خەڵکییدا تێ نەپەڕێت.

سەرچاوەکان:


1-بلاوکراوەی "لەدایکبوون" ژ:.1، سالی 1987
2-بلاوکراوەی "لەدایکبوون" ژ:.2، سالی 1987
3-ڕۆژنامەی (داگنس نیهێتەر) ی سویدیی، ڕۆژی 1988/3/29 .
4-ئێلاینە سیولینۆ، گۆڤاری: "تێمپۆس" سویدیی، 19-25 / 2 / 1998.
5- گۆڤاری "الوسط"ی عەرەبی، (ژ:313) .26/1/1998
6-ڕۆژنامەی(داگنس نیهێتەر)ی سویدیی، 16/3/1998


"ڕۆشنبیران"
نوێنەری کام کولتورن؟!!
بە ئازادییمان ئاشنا دەکەن؟
یان
لەگەڵ ملکەچیدا ڕامان دەهێنن؟

*وەڵام: ژمارەکانی داهاتوو؟*

**هۆنراوە وسڵی بێ مۆراڵێتی کەس دەر ناکات**

# شەهیدەکان دەگەڕێنەوە

**ئەوانەی خۆیان بە کوشت دا بۆ مەسەلەی نیشتیمان بوو، لەم شەهیدانە چی دروست کرا؟ پرسیارێکە لە بەردەمی هەمووماندا**

**بە چ هیوایەکەوە شەهیدێک بەرەوڕووی مردن دەچێت؟ چۆن ئەو شەهیدە بیر دەکاتەوە لە کاتێکدا دەزانێت کە تەنها چەند سەعاتێکی ماوە لە ژیاندا. ئەو هەستانە کامانەن کاتێک هیچ شتێک لە بەردەمی مرۆڤێکدا نامێنێتەوە جگە لە پێنوسێک و پارچەیەک کاغەزی لول کراو؟ لێرەدا هەندێک لە نامەی سێ مرۆڤ دەخەینە بەرچاو.**
**ئەم نامانەی ئەم شەهیدانە دەینووسن، نامەی ئەو مرۆڤانەن کە ژیانیان بە زۆر لێ دەسەنرێتەوەو دەبێت وەبەرزو نەترس و جوامێرش بن لە بەردەمی پەتی سێدارەدا. سەرەڕای ئەوەش هەست بەوە دەکەن کە ئەوەی کردویانە گەلێک کەمترە لەوەی کە خواستیان بووەو هەقی پێشمەرگایەتیی بە خۆیان نادەن. ئەم نامانە چی لای تۆ جێ دێلن، شتێکە لەوانەی کە ڕونی دەکاتەوە تۆ خۆت کێیت؟**

## نامەی ژمارە 17

ناوی شەهید: ڕەفیق مارف
ڕۆژی لە سێدارەدان: 1979.4.24
بەندیخانە: موسڵ

-سەرەتای ژیان خەباتە، مایەی خەبات سەرکەوتنە، شۆڕشگێڕ ئەو کەسەیە کە لە دوا پلەی خەباتدا خۆی ببینێتەوە. شۆڕش کاری جەماوەری گەلە، گەلیش خاوەنی چەندین شۆڕشگێڕو تێکۆشەرە. هیچ هەورازێک بێ سەرەوخوار نیە. شۆڕش کارێکی ئاسان نیە. شۆڕش هەڵمەت و قوربانی و شکست و سەرکەوتن و فەوتان و سەرخستنە.
-ئەوەی کە من داواکارییم لێتان هەیە ئەوەیە بە پێشمەرگەیەکم قبوڵ بکەن، بە کوردێکی ڕاستم دابنێن، وە هیوادارم گەلەکەم بە شەهیدێکی خۆییم قبوڵ بکات.

## نامەی ژمارە 18

ناوی شەهید: ئاوات عومەر عەلی
ڕۆژی لە سێدارەدان: 1979.5.2
بەندیخانە: موسڵ

-مرۆڤ لە گەورەترین شت ببەخشێت تەنها گیانێتی، ئێمەی لاوی کوردیش، هەر ئەوەندەمان لە توانادایە کە گیانمان ببەخشین و گیانفیداکاریی بکەین لە پێناوی ئەم خاکە جوانەو ئەم میللەتە هەژارەی کورددا.
هەر ئاواتەخوازی ئەوەم کە شۆڕشە مەزنەکەمان هەر لە گەشەکردندا بێت و بەرەو سەرکەوتن بڕوات،
تۆڵەسەندنەوەمان لە دوژمن لە بیر نەچێتەوە،
وە داواکاریی من هەر ئەوەیە بە شەهیدێکی کورد، بە پێشمەرگەیەکی دڵسۆزی کوردم دابنێن.

## نامەی ژمارە 20

ناوی شەهید: دکتۆر مارف (عوسمان عبدالرحمان محمد)
رۆژی لە سێدارەدان: 1979.6.18
بەندیخانە: موسڵ

-من شەهید ئەکرێم، بەڵام ئێوە خۆش بن، کورد خۆش بێت، مامەم خۆش بێت، هەژارو چەوساوەکانی ئەم گەلە خۆش، تەنیا غەمم ئەوەیە کە نەمتوانی درێژە بدەم بە خەباتکردن و نەمتوانی خزمەتی تەواوی گەل بکەم، بەڵام شانس وای هێنا کە منی رۆڵەی هەژارترین جوتیاری ئەم کوردستانە هەر ئەوەندەم بەربکەوێ لە خەبات کە خۆم پەتی سێدارەی دوژمن بخەمە گەردن، بە زەردەخەنەوە ئەو وتەیە بڵێمەوە: ژیان زۆر خۆشە، بەڵام مردن لە پێناوی ژیانی خەڵکیدا لە ژیان خۆشترە.

*سەرچاوەی نامەکان:*
چەند نامەیەک لە زیندانی فاشیستەکانەوە/ یەکێتی نیشتیمانی کوردستان، دەزگای چاپ و بلاوکردنەوە -10- سالی 1982

---

## پارچەیەک لە شیعری: داستانی شارەکەم

چ خێزانێک کوڕێک، دووانی،
لە بەرچاوان بزر نەبووە؟
نەڕۆشتووە بۆ سەفەری نەهاتنەوە؟
ئاهی دایک دوکەڵێکە
لەم وەرزەدا
لە بناری هەموو کێوەکان هەڵ دەستێ
تەرزەیەکی ئیقلیمگیرە
دار بە داری
هەموو ماڵەکان دەکوتێ
شەهید شوێنی دەستوپەنجەی
لەسەر چی جێ نەهێشتووە،
مەگەر هەواو خۆڵیش بۆنی
شەهیدانی نەگرتووە؟

غەم: شەهیدە
غەم ئاودانی باخ و لاسیک پچڕانەوەی
عەسرو ئێوارەی حەوشەیە،
بۆڵە بۆڵ و
ناوچەوان گرژکردنی
نیوەڕوانی نانکردن و جل شتنە.
غەم.. کۆتری ئێوارەیە
دەنوکی لە پەڕی سنگیا شاردۆتەوەو
بەرامبەر بە حەوشێکی چۆڵ هەڵ نیشتووە،
غەمی.. شەهید
بزەی سەرلێوی کوشتووە.

**ناڵە،** 1986

## سەرەتای پرسیارەکان

*شیعری: لەتیف هەلمەت*

شەهیدانمان
ناونیشانی لووتکەی سەخت و
شیعری بەرزن
لە ترسی شەهیدەکانمان
دوژمنانمان
لە شیعرەکانمان دەلەرزن
لە ترسی شەهیدەکانمان
ناحەزانمان
لەگەورەکانمان دەترسن

ئەی ئێتر بۆ نان و بەرگی
منالانی شەهیدەکانمان دەدزن
بۆ تەنانەت کفن و گڵکۆی
شەهیدەکانمان دەفرۆشن
بۆ ناترسن
(شەهیدەکان ئەم هەفتەیە
لە توێی کفن و گڵکۆ دەرچن)
دەس بدەنەوە تفەنگ و
ئەم جارەیان
ڕوو بە ڕووی ئێوە بوەستن
بۆ ناترسن...؟




چۆن بیر دەکەنەوە، ئەوە پەیوەندی بە خۆیانەوە هەیە، بەڵام کەڵاوەکەی پشتیان پرسیارێکی سیاسیە لەبەردەمی هەمووماندا.

Fax. 018-24 03 83

Adress:
M S D C
Albert Engströmsg.3 tr 2
754 30 Uppsala Sweden

نرخی ژمارەیەک لە سویددا ٣٠ کرۆنە، بە پۆستەوە ٤٠ کرۆن.

بۆ دەرەوەی سوید ٤ دۆلار، جگە لە پارەی پۆست.

خاوەنی حساب: S. Ahmed

ژمارەی حساب: Post giro: 6196267-6

CONTRACT
Political Journal
Number 2
April 98

## No one is born as a leader and no leadership is for life

*In this issue:*





Kurdish children; victoms of mines, and internal and external conflicts



Kurdistan is a densly mined region. 20% of agricaltural land is unusable because of mines

*Some qoutes:*

*"The next war in the Middle East is fought over water, not politics", Butrusghali (National Geopgraphy)*

*"Our policy is to get rid of Saddam Hussein, not his regime", A former CIA Deputy (ABC News)*

*"The seemingly attractive goal of geting rid of Saddam Hussein, would not solve our problems or even necessarily serve our interests", National Security Advisor Gen. Brent Scowcroft (News Week)*